




لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری
زنجیرە کتێبی ئینستیوتی کەلەپوری کوردستان
( 6 )

# پەندی کوردی: چیرۆکەکەی

لێکۆڵینەوەو ئامادە کردنی
عومەر شێخەللا دەشتەکی

پێداچوونەوەی
تاریق سالح قەراجی

**بڵاوكراوەی وەزارەتی رۆشنبیری**

**زنجیرە كتێبی ئینستیوتی كەلەپوری كوردستان** *

( 6 )



ناوی كتێب: پەندی كوردی: چیرۆكەكەی

ئامادەكردنی: عومەر شێخەڵلا دەشتەكی

پێداچوونەوەی: تاریق ساڵح قەراجی

نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە: هەنگاو ئەنوەر شێخانی

تایپ: جەلیل عەبدولواحید بۆتانی

سەرپەرشتی چاپ: دەرباز مامند ئاغا رواندزی

چاپ: چاپی یەكەم 2006/هەولێر

تیراژ: 1000 دانە

لە كتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (**756**) ساڵی 2005 دراوەتێ

---

* **ناونیشان : هەولێر – ژێر كتێبخانەی گشتی هەولێر – بەرامبەر وەزارەتی تەندروستی**

**تەلەفۆن : 2238301 - 2238302 - 2519558**

# مەرگی پێشوەخت

ئەگەر ناوی نووسەر و ناوداران، هۆیەك بێ بۆ ناسینی وڵات و شار و زێدی ئەوان، ئەوا مامۆستا/عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی/ لە ڕیزی پێشەوەی ئەو ناوانەیە، هەر کەسێك کەمێك شارەزای کۆمەڵی کوردەواری بێ، ئەگەر یەکەمجاریش بێ ناوی ئەو بەڕێزە ببستی، ئەوا هەر زوو سەرنجی بۆ/دەشتی هەولێر/دەچێ و بۆنی /کەندیناوەو قەراج/ لەناوەکەی دەکات و هەر زووش تێدەگا ئەو نووسەرە خەریکی فۆلکلۆرە.

سی چل ساڵ پێش ئەمڕۆ لە نێو نووسەرانی کورد، تاك تاك نووسەر هەبوون خۆیان دابووە فۆلکلۆر لە کوردستان، بەڵام" ئەو دەم دەشتی هەولێر و کەندیناوەو قەراج کەسی لەو تاك تاکانە بەرنەکەتبوو، ئەو دەشتە هێشتا بەیارەکی کار تێدا نەرکابوو. ئەگەر چی دەمێك بووو، هونەرمەندی گەورەی کورد حەیرانێژ/ڕەسول گەردی/ بە دەنگە خۆش و گوتنە جوانەکەی/حەیران/ی دەشتی هەولێری بە کوردستان و دنیادا بڵاوکردبووەوە. بەڵام، هێشتا فۆلکلۆر ناسێك و کۆکەرەوەیەکی فۆلکلۆر لەو دەشتە بە پیت و دەوڵەمەندە ڕەچی نەشکاندبوو. هەر لەو ساڵانەدا قوتابیەکی هۆشیار و کوڕە کرمانجێکی لێهاتوو بە عەشقەوە خۆ لە قەبەر فۆلکلۆری کوردی بە گشتی و دەشتی هەولێر بە تایبەت دەکات .

مامۆستا/عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی/ یەکێکە لەو مامۆستا دەگمەنانەی /دەرچووی بەشی کوردی/یەکە سەرەڕای گوتنەوەی دەرز و پێگەیاندنی لاوانی

کوردســتان و بڵاوکردنــەوەی ڕۆشــنبیری کــوردی، بــە کــردەوەش خــەریکی کۆکردنەوەی ـ فۆلکلۆر ـ ی کوردی بوو .

ماموٚســتا وەك هــەموو گــەنجێکی ســەردەمەکەی خــۆی، ســەرەڕای کــاری ماموٚســتایی و کۆکردنــەوەی فۆلکلــۆر لــە سیاســەت و هەســتی نەتــەوەیی و نیـشتیمانیش بـە دوور نـەبوو، نـەك هـەر دوور نـەبوو! بەڵکـە بـەردەوام لـە نـاو جوڵانـەوە سیاسـی و پیـشەییەکانیدا بـوو، لـەم ڕێگایـەش لـە ڕۆژە تەنگانـەکان ئازاری زۆری چێشت و هەر ئەم ڕێگاو خەباتەش ڕاپێچی نێو بەندیخانەی کرد .

هـەر چەندە سیاسـەت و حزبایـەتی هۆیـەك بـوو، بۆ قۆڵکردنـەوەی هەستی نیـشتیمانی و فۆلکلـۆر دۆسـتی ماموٚسـتا، ئـەوا هـەر ئـەو خـەبات و ڕێگایـەش هۆیەك بوو، بۆ کەم بەرهەمی ماموٚستا لە بواری نووسینەوە، ئەگەر ـ سیاسـەت ـ بەشـێکی زۆری کـات و تاقـەتی ماموٚسـتای بـۆ خـۆی ڕاکـێش نـەکردبا، ئـەوا بێشك ئەمڕۆ بەرهەمی ماموٚستا زۆر لەوە دەوڵەمەندتر دەبوو کە ئێستا هەیە .

ماموٚستا هـەتا لـە ژیانـدا بـوو، ئەوندەی بـۆی کـرا، بـە دڵـسۆزی و بـە پـاکی خزمـەتی فۆلکلـۆر و ڕۆشـنبیری کـوردی کـرد، خزمـەتێك بـیٚ خـۆ هەڵکـێشان و منەت بەسەرکەس کردنەوە، هەر ئەو خاکییەی ماموٚستاش خـۆی هۆیـەك بـوو، کە ڕاگەیاندنی کوردی هەتا لە ژیاندا بـوو، ئـەو گرنگییـەی پێنـەدا. کـە دەبوایـە پێی بدریٚ .

لـەو پێـشەکییە کورتـەی ـ کـە وەکـو دیـارە/مـردن/ مـاوەی نـەداوە تـەواوی بکات ـ ماموٚستا زۆر شتی باس کردووە. بە تایبەت/تارمـایی مـەرگ وەك خـۆی دەلـیٚ/ کـە دەوری ماموٚسـتای داوە، چ بـە هـۆی مـەرگی/هاوتەمەنـەکانی/و چ بەهۆی باری تەندروستی خۆیەوە. ماموٚستا دەنووسیٚ:

((خوێنەری هێژا: تارمایی مەرگی سامدار نـاوە نـاوە ئـازیزێکی هاوتەمـەنم دەخاتــە نێــو بــیرازەی گــۆڕەوە)) ئــەم/بیــنین/و/هەســت پێکــردن/و/نزیــك

بوونـەوە/ی/مـەرگی سـامدار/ە مامۆسـتای وا لێکـردووە بـیر لـە کـارە گـرنگ و پێویستیەکانی خۆی بکاتەوە، ئەویش /کاری نووسین/ە بۆیـە دەنووسـێ ((لـەم بۆچوونەوە، خەریکە، بەرهەمـەکان بـە باشـی تـاوتوێ بکـەم، تـا نـەوەی ئاییـندە سوودیان لێببینن)) لەم ((وەسیەت))ە کورت و (پێشەکی)یە کورتەدا مامۆستا( عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی)باسی دوو شت دەکات، (بەرهـەم)ەکـانی و (نـەوەی ئاییندە) ئەمەش خەسڵتی ئەو کەسانەیە کە کارەکانی خۆیان خۆش دەوێ و بڕوایـان بـە ئاییـنـدە نـەوەی داهـاتوو هەیـە. هـەروەها وەك خـۆی دەنووسـێ ((خەریکە" بەرهەمەکان بە باشی تاوتوێ بکەم)) زمان حاڵی نووسەر دەڵێ: بۆ ئەوەی پێش مردن (( هەر چوار بەرگی چاپکراوی پەندی کوردی لەگەڵ بـەرگی پێنجـەمی چـاپ نەکراوەکـەی لـەتوێی تاکـە کتێبێکـدا بـە چـاپ ڕابگـەیینم)) بەداخـــەوە مامۆســـتاش وەك زۆر لەنووســـەرانی تـــر بەرهەمـــەکانی خـــۆی بەسەریەکەوە بە چاپکراوی نەبینی ـ کەکارێکی ئەستەم نەبوو! بەو هیوایەی زۆر نەخایـەنێ، تـەوای بەرهەمـە چـاپ کـراو و نـەکراوەکانی ئـەم نووسـەرە بەسەریەکەوە/بەباشی/و لەچاپێکی نوێدا ڕوحانیەتی مامۆستای پێ شاد بێ .

پـایزی ئەمـساڵ گـەڵای زۆر نووسـەر و هونەرمەنـدی کـوردی هەڵوەرانـد، مامۆسـتا/عومـەر شـێخەڵڵا دەشـتەکی/ش یـەکێ بـوو لـەو نووسـەرە فۆلکلـۆرە پەروەرانەی کە بە ئاسانی جێگاکەی پڕناکرێتەوە .

لاشەکەی بە خاکی کوردستان شادبوو بەو هیوایەی گیانیشی بە بەهەشت شاد بێ .

مەولود ئیبراهیم حەسەن

هەولێر

پایزی/2005

# پێشەکی

خوێنەری دڵسۆزی پەندو پەیڤی ڕەسەنی کوردی، مێرمنداڵ بووم لەکاتی نەبوونی یاری زارۆکانی ئاوایی، دەچووومە لای جوامێرو پەککەوتەو بە ساڵاچووانی گەڕەك کەلە پەسارگەیەکی بێ سەروەدەدا ڕۆژانە لێی کۆدەبوونەوە، گفتوگۆ گەرم دەبوو، بەسەرهاتی خۆیان، ڕابردووانیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، بەجوانی تاوتوویان دەکرد، بابەتی لێدوانەکانیان بە ئاخاوتنێکی بەپێزو ڕەوان دەمەیاند .

جیهانی بەهای خوێندن لە کوردستان برەوی پێدرا، بەسایەی نەوەی ئاغەی میرە دێ، بەهەروەزی کارکەرو ڕەنجدەرانی گوند، قوتابخانەیەکی خنجیلانە دروستکرا، مامۆستایەکی سەرکۆتی بۆ هات، باوکم بە گەورەیی لەگەڵ منداڵان منی لەبەر خوێندن دانا. قوتابییان خوێندنی سەرەتاییان تەواوکرد، بۆ خوێندنی ناوەندی هاتنە هەولێر، چەند مانگێکی پێچوو بە ژیانی نوێی شار ڕاهاتین. بە بەردەوامی لەخوێندن، گەیشتنە ئامادەیی، لەوتەمەندا بۆ یەکەمجار خامەم بەنیازی نووسین گرتە دەست، چیرۆکی – خانزادی بەخت ڕەش – م لە گۆڤارە هەفتانەییەکەی هەولێردا بڵاوکردەوە، هاندانی دۆستو ناسیاوان ئارەزوویان بەگەڕ خست، تا دەسەڵاتی ئەو سەردەمە دای خست بەرهەمم لێ بڵاو دەکردەوە.

قۆناغی ئامادەیی بەئاکام گەیشت بۆ تەواو کردنی خوێندن ناردراینە بەغدا، لەوێ ژیانی زانکۆ، کتێبەکانی: شاوەیس، جیاوك، خاڵ، وردی، شەیدای

کەلەپووروو سامان – فۆلکلۆر– ی نەتەوایەتیان خستە هەستو هۆشەوە، لەو ڕۆژگارەوە هۆگری پیرەمێردو پیرێژنان بوویم، بیٚ کات بەفیرۆدان، بەکاوەخۆ، خەریکی دەسکەچنەی بژارکردنی – فۆلکلۆر– م، بەرهەمێکی باشم خستە بەردەستی خوێنەرانەوە.

خوێنەری هێژا: تارمایی مەرگی سامدار ناوە ناوە ئازیزێکی هاوتەمەنم دەخاتە نێو بیرازەی گۆڕەوە، لەم بۆچوونەوە، خەریکە، بەرهەمەکان بە باشی تاوتویٚ بکەم، نەوەی ئایندە سوودیان لێبینن. لەم بڕوایەوە نیازم وایە هەر چوار بەرگی چاپکراوی پەندی کوردی لەگەڵ بەرگی پێنجەمی چاپ نەکراوەکەی لەتوێی تاکە کتێبێکدا بەچاپ ڕابگەیێنم تا جگەر گۆشەکانی دوا ڕۆژ شارەزای ئەوە بن بەرهەمی ڕابردووان بە داهاتوویان گرێدەن، چونکە لێکدابڕانی زیان بە ئاستی ڕووناکبیری سەرجەم کۆمەڵ دەگەیەنێت. ئەم پەندو گۆتانە لە ژینگەی شار، گوند، کۆچەرایەتی... هاتینە بەرهەم، بەداخەوە لە نەبوونی وشیارییەوە، گێڕەڕەوەی گێرەشێوێن دەیاندەنە پاڵ ئەمو ئەوی بێگانانەوە.

عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی

## سەرنجێك

سێ ڕۆژ بەر لە كۆچی دوایی مامۆستا عومەر شێخەڵلا دەشتەكی بە یەكەوە دانیشتین باسی دەستنوس وپرۆژەكانی خۆی بۆ كردین، ئەم بەرهەمەی بەردەست یەكێك بوو لەو پرۆژە كارانەی كە ئامادەی كردبوو، هەر ئەو كات ناردی بۆ ئینستوتی كەلەپوری كوردستان بەمەبەستی بە چاپ گەیاندنی، بەڵام گوتی پێشەكییەكەم تەواو نەكردووە، تەنها ئەو لاپەڕەیەم نووسیوە دوای چەند ڕۆژێكی تر تەواوكەری پێشەكیەكە دەنووسم بۆتان دەهێنم. ئیتر ئێمە لە چاوەڕوانی گەیشتنی پێشەكییەكە بووین، كە بە داخەوە لە ڕێكەوتی 27/ 2005/9 هەواڵی كۆچیمان پێگەیشت.

دوای بەشداری كردنمان لە پرسەكەی، لە نزیكەوە لە كەس و كاریمان پرسی ئاخۆ تەواو كەری پێشەكییەكە كە بڕیاربوو بینووسێ و بۆمان ڕەوانە بكات نووسیویەتی یاخود نا ؟ دوای گەڕان و سوڕان لە نێو پەرتووكخانەو پەڕاوەكانی هیچیان نەدۆزیەوە، دیاربوو هێشتا نەی نووسی بوو، كە بۆ دواجار ماڵئاوایی كرد، بۆیە ئێمە ناچار بووین ئەم ڕونكردنەوەیە بنووسین تاكو خوێنەرانمان لە تەواو نە نووسرانی پێشەكییەكە ئاگادار بن.

بە ڕاستی كۆچی ناوادەی مامۆستا دەشتەكی زیانێكی گەورەبوو لە بواری ئەدەب و فۆلكلۆری نەتەوەكەمان كەوت، كە بە درێژایی ژیانی خەریكی دەسكەچنەو بژاركردن و كۆكردنەوەی بەرهەمی فۆلكلۆری نەتەوەكەی بوو، لە دوا دیدار بە نیاز بوو لە ڕێگەی ئینستوتی كەلەپوری كوردستان بەرهەمەكانی بەچاپ بگەیەنێ هەروەك خۆی دەیگوت:(نیازم وایە هەر چوار بەرگی چاپكراوی پەندی كوردی لەگەڵ بەرگی پێنجەمی چاپنەكراوی لە دووتوێی

**تاکە کتێبێکدا بە چاپ بگەیەنم) لەگەڵ چەند بەرهەمێکی تر دەست نووسی هەبوو، کە بڕیار بوو دوای ڕێکخستنەوەیان وێڕای چەندین پرۆژەی تر کە هەموویان خزمەتکردن بوون بە سامانی فۆلکلۆری نەتەوەییمان بیانهێنێتە ئینستوتی کەلەپوری کوردستان، ئەو بەرهەمەی بەردەستیش هەروەك ئاماژەمان پێدا یەکێك بوو لە پرۆژەی کارەکانی، بەڵام دیارە تارمایی مەرگی سامدار وێڕای ئازیزە هاو تەمەنەکانی ئەویشی خستە نێو بیرازەی گۆڕەوە، ئەو ئاواتەی لەگەڵ خۆی بردە ژێرگڵ، ئەو بەرهە چاپکراوەی بەچاوی خۆی نەدیت، کە ئەمڕۆ ئینستوتی کەلەپوری کوردستان لە دوای کۆچی دوایی مامۆستا دەشتەکی پێشکەش بە خوێندەوارانی دەکات.**

**تاریقساڵح**
**ب/ بەشی زمانەوانی**
**ئینستوتی کەلەپوری کوردستان**

# پەندو چیرۆکەکەی

1. ئاخ لە بۆ کۆییبیان ، داخ لە دەست کۆییان.
2. ئاخیری دەبتە خشە خش.
3. ئاخیری هەنجەتکی جاشکێم پێدەگرێ.
4. ئاسمانە گچکەلە ڕووخا.
5. ئاشەوان لە خەیارێك ، باراشهێڕ لەخەیارێك.
6. ئاگر لە سەفین، مەنجەری ئاو لێرە کوو دەکورێ.
7. ئامانەتی ئەو مام جەبارەی بی.
8. ئالیك لەبەر سەی، هێسك لە بەر هەسپی.
9. ئاشەوان چ دۆست چ دوژمن !

–ا –

1. ئەتو نا مزگەفت.
2. ئەرێ دایە داری کەنگر چلۆنە، کیژم وەکی ئەمن دەمدا حینچك، ئەتو دەتکرد قینچك.
3. ئەرێ مەلا، ئەرێ مەلا، هەردوو چۆکت ڕەق بی بەبا، لۆمام دەرزەی دەنێرییە غولفو لەگیا.
4. ئەگەر بەتەمای ئی خۆت دەینی ، مەینە.
5. ئەگەر بە شینی نەخورابی.
6. ئەگەور خوا بدا لە خەتە جۆتەکی دەیدا.

7. ئەگەر خوابدا دەمێ، دێرێ دینمە سەر هەر شەمێ، ئەگەر خوانەدا دەمێ سندان لەدێرێدا دوازدان لە هەر شەمێ.
8. ئەگەر دەبی بە ژنە جۆرە پێت دەدزی ڕیس و گلۆرە، قەبر تەنگە عەزاب زۆرە.
9. ئەگەر دەبی بە مەلا ژن، پێ بە خرخار دەست بە بازن، خەرکی نووشتەت لێدەخوازن.
10. ئەگەر دەیبێژی، دەیرێژی.
11. ئەگەر هەرییەکەی، پەردییەکەی.
12. ئەگەر نەدا مەعبوود، چ بکا مەحموود؟
13. ئەڵڵا هەقە ، لەجێی ڕەقە – لەقلەق –
14. ئەڵڵا ورمان ، لەجێی نەرمان – ڕیوی –
15. ئەمشەو شەوی گا سوورە.
16. ئەمن دەکەی شینێ ئەو کەشکەك.
17. ئەوە چییە ؟ ئاغەی گۆتییە هەڵڵایە.
18. ئەوەش بووە فشە.
19. ئەو بارەی لە منە لە قاتریش بی دتڕی – هێستر.
20. ئەو بنملانە پێکدادە، سوفیسمایل سووتا.
21. ئەو تەنیش و ئەو تەنیشت، هەردوو قۆرو ڕاستە پشت.
22. ئەوڕۆ ئاش، سبەی تەڕاش.
23. ئەوی شینی پەلك پان، شین دەبی لەدەو ئاوان.
24. ئەوی لە ژنی خۆشی بترسێ، بە مردی حیسابە.
25. ئەوی لەماری بابت سمیت، لێرەت بسمی بووابە، ئەوی لێرەت سمی لەماری بابت بتسمیبووایە.

26. ئەوی هەق برێ، کراوی دەپەڕێ.
27. ئۆخەی تڕا خۆمو سڕا خۆم لە بن کەچە بەڕا خۆم.
28. ئێرە جاستانە، کیستان نییە.
29. ئیشی ئەوڕۆ مێخە سبەینێ.
30. ئێمە چرگەیەك مرگەك.

– ب–

1. بابی بابم سەید ئۆمەر.
2. بابی من کەتو مۆت.
3. بارانە مەوارە، شیوو شیو وەڕۆن.
4. بارم لەبان گایە، کوڕم لەبەر خیندن دانایە.
5. بالوولی بەغدایێ، ڕازی بوو بە کایێ، بەر باشیان نەدایێ.
6. بەخۆم ڕووس نیمە، هاگاس لەزۆمێ نییە.
7. بەڕدێنی بە گوتڕا دیارە.
8. بە سەروەرێو بە پەروەری تەواویان نەکرد جۆڕکی کەرێ.
9. بە سمخڕێو بە قوز خڕێ کەلکی شکارتەکیان بڕێ.
10. بەشەو سایە، بە ڕۆژ بایە، بەزی لە کلکی بزنێ دەکاتە کایە.
11. بەش – پیشە – ی لاوان بۆق خواردنە.
12. بە فێران ، بە فڕان ، سۆرێم لێستاند لۆ کوڕان.
13. بە کەفەرێ سپی نەگڕاوە، بە دەسکە پووشان ناگەڕێتەوە.
14. بە مەندیلی بە گووتڕا دیارە.
15. بەند کار کەرو جۆی لێکدەکا.
16. بە هووەك گرد، بە تڕەك براو.

17. بەو چاکەی لەغەر غەرۆشکێ، لێم بگری قەرقە رۆشکی، لێم بشکێ هەردوو چۆکێ.
18. برێنە پیرە ئامانێ هەر سێ مانگی زستانێ لاقم بردە عاسمانێ، گریمان بۆرە نەهاتەوە لە گاڕانێ.
19. بزن تارەتی هەر ناگری.
20. بزنێ پۆش ئەمنو توخۆش، بزنێ بە لەکار لەوێ بوو مردار، بزنێ بەلەمس هەر لێی مەپرس.
21. بشفڕی هەر بزنە.
22. بووە فشەی بنسراوەی.
23. بووە نووشتی قەشەی.
24. بووك لەسەر زینی یا ڕسق یا نسیب.
25. بووکێ پێ لە ڕکێبێ، نازانی نسیب بۆ کێ؟
26. بووکی سارێ، گۆلکی سارێ ، بزربوون لەشاری هەریری.
27. بووکێ مام وەسمانی، بە ڕۆژ دەچێتە کۆرانی، بەشەو دەچێتە قەزوانی.
28. بوویتە گورگی کەنعانی.
29. بۆقبۆقیلەی ناو ئاوان، سەردەرکە لەتەنکاوان، یەك نەمینێ لە لاوان.
30. بیستو یەکەی گۆرانی ، بردە سەر کانی، کورتانی هێناوە بە شانی.
31. بیستو یەکەی گۆرانی هەرمن هەرمن ، ئەوی لەبەر زستانێ مایەوە هەمووی گەییە من.

– پ –

1– پاشا : هەی ناشوو نەوار.

2–پاشە سەر لەخۆ ، ساجباخ لەخۆ ، سەعۆ بیبە بەخێراخۆ.

3–پەڕی دەرکرد.

4–پڕ دەبێتەوە جێی خەنجەران ، پڕ نابێتەوە جێی کەسەران.

5–پوورە نەنیٚ ، پوورە نەنیٚ ، ڕازی نەبووی بە مەفتەنیٚ، هەتا لێیاننای بە ترخێنیٚ.

6–پیاو ئەو گوو خواردنەیان هەر هەیە.

7–پیاو خوا نانەکی دایی، دەبی بزانی بیخوا.

8–پیرە لە مردنە ، جوانە لە مێرد کردنە ، مارە لەخراپ کردنە.

9–پیریٚ ، کەونینەت وە بیریٚ.

10–پیریو تەماکۆ ڕیشی کردم زەرد، ئەو یارەی دەمبرد بن بەردو بن بەرد.

ئێستا دەکۆکم دەریٚ قوزە لقورت و دەرد.

11–پیشەی لاوان هەر بۆق خواردنە.

– ت –

1. تاژی و شوشکەدا ، لە بن پووشو پەراشا وەرە دەرە.
2. تەماع بێتە گۆڕیٚ ، برا برای ناناسی.
3. تەماع بێتە گۆڕیٚ ، گوجیلەی کوریتەکی یەکدی ناناسن.
4. تفەنگی وی خاڵی ، دریٚ من قەرار ناگری.
5. تەگبیر کەریٚ ماریٚ ژن بی ، گیسکی ساری دووجار بڕبی.

–ج–

1) جارەکیش برێن بەهی دایکە نەخۆشە ، لەبەر چم نییە، سەرو درم پێی خۆشە.
2) جاری ئەو کوڕەی گەورەکە.
3) جریو جریو.
4) جوو هەزار لیرەی دا ، شەوەکی منداری لە جێیان نەنوی.
5) جیٚ سمی کەرێییە ، خەسرەتی ئەسمەرییە.

– چ –

1) چارەنووس بەکەس ڕەتنابێتەوە.
2) چاوت بە چاوی زەرەری دەچوو.
3) چاوت ببیتە گیسکی هەیاسی ، نابینی بابی ئەلیاسی.
4) چرای هەرکە سووی تێماوە.
5) چلە: ڕۆژەکم مابی لەکارا، کیلکی گیسکیٚ دەکەم بەدارا.
6) چمان بەچاوی خۆ نەدیتییە ، چی چاکیشمان گێلێنەبووە، پیاو شکی خۆی بەقینی خەریکی نەدا.
7) چوویتە ماریٚ خاری.

– ح –

1) حاجی عەلی چاوت دەریٚ، سەری خۆت دا لەسەر دەریٚ ، جاشکۆکەت دا بە پیرە ماکەریٚ.
2) حاجی عەلی چاوت کۆرە، شفتیت دا بە گندۆرە ، گندۆرە ناوی کلۆرە.

3) **حـاجی عـەلی ملـت شـکێ، بارۆکـە – قورینگـت – ت دا بـە پـیرە مریشکێ.**

4) **حاجا ئازیکەند ، نازنی ئۆمەرم؟**

5) **حەدوودە کردمە بارگین.**

6) **حەسەنم گەورە کرد بەکەڕولاری، حوسێنم گەورە کرد بـە کـەڕو لاری ، بە زمانت هێنام بە زەبری هەوێداری.**

7) **حەمەدە لاوی گوانێ، لەسەر پردا خەڵکانی، ماز یدا بە گروانێ.**

8) **حەمەدە ڕووت سەر قەلەمدارە.**

9) **حەمەد عەیشێ دەستی شکایە، ئاغەی چ بەرایە؟**

10) **حـەیران لـە تەمتەمبـەکونی، نـە ئەمـە کرمـانجین و نـە تـوش مـەزنی، تارماییەکی لەبەر چاوی دوژمنی.**

## – خ –

1. **خەپەم تەڕە مەیتراشە، خزمان گۆتیان زۆر باشە.**
2. **خەرتەلە بە بن باری خۆیدا دەڕۆنی.**
3. **خەم لۆ مام خەمکی دەبی.**
4. **خەنجەر لە قەدم، دەمانچە لەنێکم، خۆ مریشك نیمە بە دندووکی شـەڕ بکەم.**
5. **خواردن بەشی زندییان ناکا ، نۆبەتی مردییانە.**
6. **خوشکەکت هەیە لە بالیسان، دەکا تڕوتسان، نانی مە دەبتـە سـەپکی سەیان.**
7. **خوشکەکت هەیە لە سوندس، دەکا تڕو تس، ئاردەکەی دەبا دەمینێ بنووس.**

8. خۆ دەرێن شینکە پیاوی برایما غەیە.
9. خیتێ مێردان، خیتێ ژنان، تفەك‌و شەقەك.

– د–

1. داکــی نەجمــە توجــاری ، ئــەوەل ئــەخش‌و نیگــاری ، دووەمــین داکــی جووچکانە ، سێمین مەیخانە گێڕی.
2. دایك لار بی یا مانۆکێ ، ماخدرە مرن.
3. دەبا دەربەندۆك وەت لێبێ، جوو بە بارە کوتارەوە پێت دابێ.
4. دەبانی.
5. دەچمە مارەکی کەس لەخۆم گەورەتر نەبی.
6. دەچمە مارەکی خۆم میر کوڕ بم.
7. دەردی سەی ڕەشی درایێ.
8. دەرێم دەرێم ، لاق باریك.
9. دەرێم دەرێم ، وەزت مری.
10. دەرێی گێرەی ئۆمەرە خێلی قووچییە.
11. دروونەی حەفت دەر هەمبا ویش دەزانین.
12. درۆ هەر قابیلی پیاوی گەورەیە.
13. دەرێی مریشکی خەرابە دراوییە.
14. دنیا لۆیی خۆشە، بێ دەرکەیە.
15. دۆینەی بەزڕە پوونگی.
16. دێرێ چاوم هەر لێتە.
17. دینی محەمەد بە ئاشکرایی خۆشە.

18. دواسی هەر ئاگرەکی لێدا بگیرسێ.

– ر–

1. ڕاستی برێ، ڕاستیت لۆ دێ.
2. ڕاستی ڕاستی لێدەبیتەوە.
3. ڕۆنش مالا، دۆش مالا بۆ تیشتا پالا.
4. ڕیوی: هەچۆمە چۆمە چۆمە، دنیا بە کەیفی خۆمە، دایکی جووچکان دەخۆمە.
5. ڕیوی: هەمریشکە مریشکە لانێ، سینگت خۆم سیقەدانێ.
6. ڕیوی: ئەو مقامەی مەرێ دەترسێم.
7. ڕێی شەغران هاردادو.

– ز –

1. زستان: ئەگەر نەمرم لێت دەکەمە بەفروبا ، بەزت لە کلکی دەکەمە کا.
2. زستان سەپانە ، هاوین تێلە کێش.
3. زوورگەزراو نازانی کاکم مردییە، خۆت لە کوریکان عەمراندییە.

– ژ –

1) ژن ببوونە گەورەی ماران ، گیسکیان دەبڕییەوە ، کاوڕیان نەدەبڕیەوە.
2) ژن هەیە ، ژنۆکەش هەیە.

– س –

1) سەخی نانەکی دەخورێ ، گەندە دوو.
2) سەر لە بن بەڕێ ، قوون دەکا شەو لەوەڕی.
3) سەلامو عەلیك ئاغەی دەنگنەکەر، پیلەکەم دڕا قۆرم هاتە دەر، بە ڕۆژ ڕۆژە سارت بردە سەر.
4) سەودای بارات بم لە دوور دیاری، یا بۆرە پنچك عارەب سواری، بە خۆت وەت لە خۆکرد، بەردت لێباری.
5) ستیلەی نان لەسەر خۆ، ستیلەی کراس لەخۆ، ڕەشۆ بیبە بەخێراخۆ.
6) سۆڤ هەمینۆ، خۆ بچەمینۆ، مارەیی منو تۆ لە عاسمانێ هاتینۆ.
7) سێوەك بووم لە سێوی نەمولکی، کەتمە دەست مل بە چرکی، نازانم نە بۆ خۆییم دەخوا نەدەمداتە خەریکی.

– ش –

1. شان بە قوڕ لەخۆ بەشکە.
2. شەقریان شکاندی.
3. شەیتان: بە مەندیلی سەرتڕا دیارە.
4. شێخشەروان گومەتی هەر ناگری.

– ع –

1) عەولا ڕەشە ، ئەو هەر بەشە.

– ف –

1. فاتیحەکی دەخینم لۆ وێ مەقبەرێ ، حەمبێزی لێداوێمە دەری .
2. فەقیر لۆ فەقیرە ، با هەر بخوا برنج بەشیرە.
3. فسۆغلییە بەسەر فەرخەی خۆیدا دەفسی.
4-فیتە لبەڕیا فیتی کرد، ئەسمەر کراسی چیتی کرد.

– ق –

1. قازو قورینگ کە چەرو کۆران هەراوێرن.
2. قەلە ڕەشەکە لۆ چاکەی ناقرێنی.
3. قوربانت بم کوڕی سێو لە باغەری.
4. قونگرو قەرارت بە بنەوە هات.

– ك –

1. کافر کوشتن غەزایە ، بێ مروەتیش باش نییە.
2. کاکەڕەش دیتییە خەرکی قرش پرش.
3. کاکم سوار بوو لەگەر سواران ، بەفر ڕەویەوە لە نساران ، گوو بە ڕیشی کادینداران.
4. کاو جۆ لەبەر سەی ، هێسك لە بەر هەسپی.
5. کە چوویە جێیان جێی خۆت بناسە.
6. کەرکوکی کوڕی کەرکووکی ، دوو مەلایەکەتت دێنە سەر ، گێ شۆڕمەکەوە وەك ماکەر ، زوو برێ ئە ڵلأهو ئەکبەر.
7. کوڕحەمەد مەلا دەزانی مار بکوژی.
8. کوڕم دەوێ زەنگوریان بە ملی وەکا.
9. کوڕێ خاس، لە ژنی خاس دەبی.
10. کوڕی خۆم ، لە دۆخینێ خۆم – لە دامەنێ خۆم .

11. کون بووەو ئا.
12. کوندێرە بەشەو ماندی ، بە ڕۆژ شێرە.
13. کێخوای زەنگەبات ، عەبات هەر کێشە .
14. کیرووشکی قەشقەیە ، بێ هاتە هات ناتوانی.
15. کێف لە من کێف لە گوندا ، کوڕ خنکا پەشلێ مندا ، هێشتا هەوای من زۆرە بڵندە.
16. کێندەر خۆشە؟ ئەو جێیە خۆشە کە در لێی خۆشە.
17. کین گازر نابی.

– گ –

1. گاسندز لە خۆ بە شکە.
2. گریان لۆ هەر یسەیە ، لۆ ئیمام حوسێنی نییە.
3. گزیر: پاشا قەل بەلا سمێرت ڕیباوە.
4. گورگ ئەتو قەسابی چیشت لەنار بەندییە.
5. گوند گوندی خۆمە، لە ترسی ، لە ترسی سەیان ناوێرم بچمەوە.
6. گوڵکی قوشتەپەیە ، بە یەکساری دەوی دەگاتە ئاخوڕی بە دوو ساری دەوی ناگاتێ.
7. گیسک : تڕی زستانی ئەو ساریش بە کیرم.
8. گیسک : ئەگەر لێم دەچی ئەو زستانە ، تەرک دەکەم ئەو بزن گانە.

– ل –

1. لەبەر هووردە کێران ، بەرم بە درشتە کێران وەنییە.
2. لە بن کەپری سەپانان ، دەبا خەپلێ وەتلێبێ.

3. لەخۆشی مێوانان ، خەومان نایێ.
4. لەدەرێ ڕابی ، لە ژۆرێ ڕۆمی ، هاوارم بەبەر تو ڕەببی.
5. لە سارانە ، لەمانگانە ، مارمیلۆق بە دووانە.
6. لە شەپۆلی دواوە بژمێرە.
7. لە شیرنە خەوی سبەینان و دۆی مارە جیرانان بووم.
8. لە کورتانی خۆی دەلەوەڕێ.
9. لەك‌و کوردو ئۆرمزیار، بە نەعلەت بن هەزار جار، لە گەر دەلۆی خەتاکار.
10. لەکێ شکایە ؟ لەکێ دەنگداتەوە؟
11. لەمار خەرك هەروا دەبی.
12. لە مرە مری بەرازی ناترسێ ، لە قورە قورەی کودی – جەڕە – ی دەترسێ.
13. لە وەعدی گیاو گۆران ، سازم لێدەدا لۆ جوامێران.
14. لۆت بمرم بەرمە برنجەکەی شارەزوور .
15. لۆ ترِی ؟ لە عەژمەتێ تتن.
16. لۆ چاوی بەرەکی خۆم کوێرە دەکەم، نەمردی ئاگای لێیە ، نەزندی منەتی پێیە.
17. لۆ من هەر بە ڕبەی تەقتەقییە.

– م –

1. ماچی سوڵتانە، چوو لە قوونی مەرجانە.
2. مادام دەزانی خراپە، لۆ دەیخۆی.
3. مار لە بارکردنە، مەلا کوڕم فێرە خیندن کە.

4. ماریێ بوو بەی نانیان نەبوو، تەڕە پیازیان دەچاند.
5. ماری تو دیٚ لە غەراج – قەراج –
6. ماری ڕەش لۆی دەڕشێتەوە.
7. ماری کوردی هەر لە سەر پشتی کەرێیە.
8. مامە سێنە، بە ڕەکم دیٚ بە قەردێنە، لچکی بگرە ڕایتەقینە.
9. مامۆستا وەم لۆ مارە بکە ، لەدوای من بە کەلك مندارەکانی بیٚ.
10. مەڕ بە پێی خۆی ، بزن بە پێی خۆی بەداریٚ وە دەکریٚ.
11. مەرحووم چی فەرموو.
12. قەقریۆکە، ناو لنگانۆکە.
13. مەکری ژنان چیای دەڕووخێنیٚ.
14. مەلا : مەلا قوونە ، مەلا شەرتی چوونە.
15. مڕمیاو سەدجار مڕمیاو.
16. مریشك: تاژی و شوشکەدا ، لەناو پووشو پەراشا وەرە دەرە.
17. مریشك: مام حەیدەری لە تیشی، سەر دەربینە لە تلیشی.
18. مریشك : مام حەیدەری دەربەندی ، سەر دەربینە لە کەندی.
19. مکایل یەختیار بووە، مندارەکانی نازان ئاو بگرنەوە.
20. موبارەك بی میری تازە، ئەحمەد بەگی برازا.
21. مێوان : پاشا شێرەك لە بێشەی غەزرییە.
22. مەقسەد لە قوسە.

– ن –

1. نەبی قەشان ، کوتکی وەشان ، دای لە شەشان ، حەفتەی دوڕان.
2. نەپێراوی تەنگ ، نەخانەی بە جەنگ ، نە مەلای بیٚ دەنگ.

3. نەگاوان – ئاشەوان – لە کوڕی خۆی خۆشەبی ، نەمار غەرەزی کلکی خۆی لە بیرچی.
4. نەهەورە نەسایە قەت، خەبەرەك هاتیە لـە کـن خەلیفەت ، هـەتا شـۆوو وەرد هەنە، تۆی ماوێنە بەیارا قەت.
5. نەهەورە نەسایە قەت، هەتا جوان هەنە لە گەر پیران مەنوون قەت.
6. نەهەورە نەسایە قەت، مانگ ڕەق ڕاوەستایە ، دەرێن پیاوی بیٚ ئاقر ژنی خۆی تەراق دایە.
7. نووشتەی لۆ ڕۆژی دەکا !
8. نەمیم کەرو جۆی لێکدەکا.

– و –

1. وای لە سڕی مالمی .
2. وەریٚ وەریٚ ، ئەوی لە زارت دایە مەریٚ.
3. وەکی گاوانی بەربیانیٚ دەکا.

– ه –

1. هانی مانی ، پەردەم هەر بەست لە کتانی ، بووك ئەوەتە زاوا کانی؟
2. هاوینان شلومل ، زستان جەوار لە مل.
3. هەتا ئـەتو مـەلا بـی ، ئـەو سـەر گـەورەی چاو کوسـکە کێخـوابی ، ئـەو گوندە لەوەندەی ئاوەدانترنابی.
4. هەر بریٚ حەمەد نیمە.
5. هەر پەڕە شاییە، بووکە بە خۆڕاییە.
6. هەر کەسە بە منیٚ خۆی.

7. هەرم دەگری ، یا هەرتگرم.
8. هەر هەویلیٚ ، سەر گەورەی قوون تەقیلیٚ – هەر هەوی ناویٚرم بریٚم.
9. هەیش هەیش بە دوو ڕیوییان شیٚرەکیان کوشت.
10. هیٚدی جەفتە.
11. هیٚرکە مەڕی هەمووی پیٚدەم.
12. هیڵکە ڕوونی سەر کولانکە.
13. هەریٚ نەنیٚ هەر نەنیٚ ڕازی نەبووی بەمەفتە نیٚ تا لیٚیاننای بەترخیٚنی.

– ی –

یا لە ڕیٚیە ، یا لە جیٚیە ، یا قەزیەتەی لیٚیە.

1) ئاخ ! له بۆ کۆییيان ، داخ ! له دەست کۆییيان

ڕۆژێك لـه دیواخـانێکی کـۆیی، قـسه قـسەی دەکێـشی ، قـسه هاتـه سـەر کۆییيان، هەر کۆییيەو شای به سەپانی خۆی نەدەزانی، کۆیی وا، کۆیی وا... ئـەنجام دەمڕاسـتی دیوەخـان خـۆی پێنـەگیرا هاتـه قـسه کـردن چـونکه قسەکەرەکانی زۆر بـاش دەناسین ، گـووتی : ئـاخ ! لـه بـۆ کۆییيـان ، داخ لـه دەست کۆییان.

* مەبەسـت لـەم پەنـدە ئەوەیـه ، کـۆیی چـاکه، مەردایـەتی و خراپەشـیان لەدەست دێت.

2- ا. ئاسمانه گچکەله ڕووخا.

ب- ئەڵلاّ ورمان لەجێی ڕەقان.

ج- ئەڵلاّ هەقه ، لەجێی ڕەقه.

د- ئەڵلاّ ورمان ، لەجێی نەرمان .

هـ- ئەو تەنیشتو ئەو تەنیشت ، هەردوو قۆرو ڕاسته پشت.

ڕێوییـەك و حـاجی لەقلـەقێك ببوونـه بـرادەر، ڕۆژێـك ڕێـوی داوای لـەحاجی لەقلـەق کـرد، بـۆ فرەڤین لای ڕێـوی میـوان بـی. ڕێـوی شـۆربایێکی کـەمی شـلی لێنـابوو، لەسـەر تاتـه شـاخێکی خـاوێن ڕووی کـرد، حـاجی لەقلـەق چـەند دنـدووکێکی خێوانـدی، چـی پێنـه خـوورا ڕێـوی زمـانی پێـدا دەهێنـا لووسـی دەکرد. پاش ماوەیەك ئەمجارە حاجی لەقلەق مێوانداری ڕێـوی کرد، نـۆکی بـۆ

**لێنابوو، لەناو دەرەزە شاخێکی ڕووی کردبوو، ڕێوی هیچی پێنەخورا، حاجی لەقلەق بەندووکی هەمووی هەڵبژارد و خواردی.**

**ڕێوی بە حاجی لەقلەقی گووت: کاکە فێرە فڕینم ناکەیت.**

**حاجی لەقلەق بەسەر چاو لەسەر باڵی خۆی دانا ، زۆر بلًند بوو ، باڵی خۆی شۆڕکردەوە ڕێوی لەوئاسمانە جۆنیانی شۆڕبۆوە.**

**حاجی لەقلەق دەیگوت: ئەڵلاَ ورمان لە جێی رەقان – ئەڵلاَ هەقە لە جێی ڕەقە.**

**ڕێویش دەیگووت: ئەڵلاَ ورمان لەجێی نەرمان.**

**سۆفیەك كە پەنكێكی لەسەر دارێك دانابوو، ڕێوی كەوتە سەر كەپەنكەكە، سۆڤ لە ترسان قوچاندی گوتی: ئاسمانە گچكەلە ڕووخا.**

**ڕێوی كەپەنگی خستە سەر شانی ، ڕۆیشت ، تووشی گورگی بوو.**

**گورگ: ئەم كەپەنكەت لە كویَ بوو؟**

**ڕێوی : باپیرم كارگەچی بوو.**

**گورگ : كەپەنكێكی ئەوهام بۆ ناكەیت؟**

**ڕێوی: بەر خۆلانم بەلواوە بۆ بهێنە ، بۆت دروست دەكەم.**

**گورگ: هەر بەرخی بە لواوەی بۆ دەبرد، لێی دەپرسی چەندت ماوە؟**

**ڕێوی: ئەو تەنیشتو ئەو تەنیشت، هەردوو قۆڵ و ڕاستە پشت.**

**گورگ گەڤ لێکرد، ڕێوی لە ترسا لە کونیَ مایەوە تا گورگ ڕۆیشت، ئەویش هاتە دەرەوە ، كودیلەیەك لەویَ بوو، بردی پیَ لە ڕووباریَ بپەڕێتەوە، نەمادا تووشی گورگی ببی، سوار بوو، كودیلە لەناوەندی ڕوباری لە بنی دەرپەڕی ڕێوی نقوم بوو خنكا.**

## 3.ئاشەوان لە خەیاڵێك ، باراشهێڕ لە خەیاڵێك.

ڕۆژێـك خێزانێـك باراشـیان نامینێـت ، كـابرای خـاوەن مـاڵ باراشـی دەباتـە ئاشـی ، ئاشـەوان خـاڵی باراشـهێڕ دەبێـت، باراشـهێڕ مـشتی خـۆی لـەوەخۆش كردبوو، ئاشەوان خاڵیتی مزەی ئاشی لێناستینی، ئاشـەوان بـرای دایكیـەتی، ئاشـــەوانی خاڵیـــشی خـــۆی بۆمزەیـــەكی بـــاش خـــۆش كردبـــوو، باراشـــهاڕ خوارزایەتی، چەندی بگێڕێتەوە، دەنگی نایێ.

* ئەم پەندە بە دوو مەبەست و بۆ چوونی جودا وازی یەكتر دەگۆترێت.

## 4. ئەرێ دایە، داری كەنگرچلۆنە؟ كوڕم وەكی ئەمن دەمدا حینچك، ئەتو دەتكرد قینچك.

نا چاری پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بیربكاتەوە، ڕێبازی ژیان و گوزەرانی خۆش بكات، كابرایەكی هەژار هەبوو، ژن بوو مرد، ماڵ بوو چوو، مایـەوە خۆی تاكە كچێك، لەبەر نەبوونی دەستیان كرد بە كەنگر كردن و هێنانی بۆ شار، بەهاران نـەمر و نـەژین دەرامـەتیان دادەنـا، كـچەی شـۆخ و شـەنگ و نـازدار، كـوڕە دەوڵەمەنـدی شـار داخـوازی كـرد، گواسـتیانەوە، كـچە شـەرمی بـە نـەدارایی باوكی بوو، نەیهێشت هاتوچۆی بكات.

ڕۆژێك لە پەنجەرەی تەلارەكەیەوە، سەری دەرهێنا، بۆ ئەوەی خۆی لە چفتە چفتی دەوروبەر ڕزگار بكات، گۆتی: ئەری داری كەنگرچلۆنە؟

باوكی گۆتی: وەكی ئەمن دەمدا حینچك، ئەتو دەتكرد قینجك .

* ئەم پەندە دوو بەشە لەسـەر شێوەی وەڵام و پرسیار گـوتراوە، واتاكەشـی بە كەسێك دەڵێن شەرمی بە نەبوونی خـۆی بـێ، ڕاستییەكەش نەشێردرێتەوە، تووشی وەلامی زەق ببێ .

### 5. ئەگەر بە تەمای ئی خۆت دینی، مەینە.

پیاوێکی پیری بە ناو ساڵان کەوتی ئاسایی، دەچێتە لا ی مام مۆرتکی پێی دەڵێت: زاناو دانای کوردان، لە سایەی خوا کوڕە هەیتم، ماڵە هەیتم، دەمەوێ خۆ نوێ بکەمەوە، ژنبهێنم، زانا و دانای کورد دەڵێت: ئەگەر بە تەمای ئی خۆت دەینی، مەینە.

مەبەست ئەویە، تۆ ناتوانی گەڕوگفی دەروونی ژنەکە دابمرکێنیتەوە، ژنە سەرگێڕی دەکات هاوتەمەنەکانی خۆی پەیوەندی لەگەڵ پەیدا دەکەن.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن ژنێك بهێنی لە تەمەنی خۆی بچووکتر بێ، لە ڕیشی ئەو نەوەشێتەوە هاوتەمەن و نزیکی شیاو لەنێوانیاندا نەبێت، ناو ناتۆرە بۆ خۆی پەیدا بکات .

### 6.ئەگەر خودا بدا لە خەتە جۆیەکی دەدا.

لە کوێرە گوندێکی ئەم کوردەوارییە، پیاوێك هەبوو، ئەوی کارو پیشە بوو، نەی دەکرد، ڕۆژێك لە دیوەخانێ یەکێك لێی دەپرسی تۆ لەوێ دەچییە وێ، بۆ کارێك ناکەیت؟

پیاوەکە دێتە وەڵام: نیتم چیبکەم، خەڵکی ئاوایی، کۆمەکی دەکەن، کەرستەی جۆتی بۆ ساز دەدەن، دەینێرنە بەیار کێلانێ، لاتە جۆتێك دەکات، گاسن لە کووپە زێرێك گیر دەبێت، بەلاپووتەکەی دەستی چوار دەوری دەداتەوە، لە ناو جۆڕکی کەران دەکات، دەگەڕێتەوە ماڵەوە، خەڵکی، دەرو دراوسێ لێی دەپرسن، ها ئەوەشت تەواو نەکرد!

پیاوەکە دەڵێت: ئەگەر خوا بدا، لە خەتە جۆتەکی دەدا .

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن، بە ئاسانی، لە هەوەنتە، لەختو خۆڕایی، تووشی خێرێکی باش ببێت.

**7.ئەگەر خودا بدا دەمێ، دێرێ دینمە سەر هەر شەمێ، ئەگەر خودا نەدا دەمێ، سندان لەدێریدا، دوازدان لە هەرشەمێ.**

دێرێ و هەرشەم دوو گوندن ئاقاریان لەسەریەکە، لە خوار بانە مانێ، ئاغەی گوندی هەرشەمێ دەیویست دەست بەسەر گوندی دێریدا بگرێت، تخوبی هەرشەمی فراوان تر بکات. قسە و قسەرۆك و ناکۆکی لە نێوانیاندا پەیدا دەبێ، چاو ڕاو، هەڕوگیف دەست پێدەکات، ڕۆژێك برا گەورەی گوندی هەرشەمێ لە دیوەخان، لە کاتی ئاخاوتن گوتی: ئەگەر خودا بدا......

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن، ئەگەر بوێ بسازێت دەست بەسەر بەرژەوەندی کەسانی لە خۆبێتواناتر دابگرێت .

**8. ا . ئەگەر دەبی بە ژنە جۆرە، پێت دەدزی ڕیسو گلۆرە، قەبر تەنگە عەزاب زۆرە.**

**ب . ئەگەر دەبی بە مەلا ژن، پێ بە خرخار دەست بە بازن، خەرکی نوشتەت لێدەخوازن.**

دەگێڕنەوە دەڵێن جۆلایەکی سادە و ڕەوشت پاك هەبوو، دۆستێکی زۆر ناسك و شیرینی هەبوو، فەقێیەك لە گەڕەکەکە هەبوو، بۆ مەبەستی ناپاکی خۆی، خۆی کردە برادەری جۆلا، تا بە هەر فێڵێك بێت کچەی شەنگەبی بەلای خۆیدا بشەکێنێتەوە.

ڕۆژێك فەقێی نیاز ناپاك، ڕێگا لە کچەکەکە، دۆستی جۆلا دەگرێت، پێی دەڵێت: ئەگەر دەبی بە ژنە جۆرە، پێت دەدزی ڕیسو گلۆرە، قەبر تەنگە عەزاب

زۆره، ئەگەر دەبی بە مەلا ژن، پیٚ بە خرخاڵ، دەست بە بازن، خەڵکی نووشتەت لێدەخوازن.

* ئەم پەندە بە کەسانێکی تەلەکەباز دەڵێن، بیەوێت بە فێڵ کەسێك لە خشتەببات .

## 9.ئەگەر دەیبێژی، دەیرێژی، ئەگەر هەرییکەی، پەردییەکەی.

دەگێڕنەوە دەڵێن، ڕۆژێك کابرایەکی هەژار، دەچێتەوە ماڵ، هیچیان نابێت، بیخۆن لە ماڵە پەرپووتەکەی دەگەڕێت، لە گلۆرە موویەکی مۆرانەداری بەم لاوە هیچی تر نادۆزێتەوە بە کەڵکی فرۆشتن بێت، تا چەند جەمە ئاردێکی بۆ منداڵان پێبکڕێت. گلۆرەی دەگرێتە دەست بە ناو بازاڕدا دەسووڕێتەوە، های گلۆرە مووی باش، ها گلۆرە...! حاجییەکی تەڵەکەبازی لیٚ ڕاست دێت، نیو تەنەکە ئاردی زیوانداری پڕ ئەسپێی لە دووکانیٚ مابووەوە، بانگی دەکات: ئەری ئاڵوگۆڕی موو بە ئارد ناکەیت؟!

پیاوە نەبووە دەستکورتەکە دەڵێت باشە، پێك دین، لە ڕۆیشتندا حاجی دەڵێت: ئەگەر دەیبێژی دەیرێژی .

کابرای هەژاریش دەڵێت: ئەگەر هەرییکەی، پەردییەکەی .

## 10. أ. ئەمن دەکەی شینیٚ ئەو کەشکەك .

## ب.گریان لۆ هەریسەیە، لۆ ئیمام حوسێنی نییە .

خێفرۆشێکی قەراجیٚ دێتە کەندیناوەی، یەك لە کێخواکانی سیانەتی مردبوو، خەڵکی گوندەکە لێکرا دەگریان، ئەویش دەستی بە گریانی کرد، یەکی مەفتووق لێی پرسی ئەو مردووە دەناسی؟ گۆتی: ناوەڵڵا، گوتی: ئەدی ئەو گریان و ڕۆ ڕۆیەت لەچی؟!

خێفرۆش گوتی: ئەمن دەکەی شینیٚ ئەو کەشکەك.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەگوترێت لە خۆڕایی بۆ بەرژەوەندی خۆی نەریتی باو ببەزێنێ.

### 11–ئەگەر نەدا مەعبوود، چ بکا مەحموود .

دەڵێن شەوێك سولتان مەحموودی غەزنەوی خۆی گۆڕی بوو، دیتی دوو کوێرە لە مزگەوتێك ئاواتە خوازی خواردنی پلاوێکی بە گۆشت دەخوازن.

سولتان دەنێریتە ماڵەوە، لە نگەرییەك پلاو دروست دەکەن مریشکێکی سورکراو لە ژێر پلاوەکە دادەنێن، بەخوبزەیەك بۆیان دەنێرێت، کویرەکان ئاگایان لەم کەینو بەینە نابێت، دەستی بۆ دەبەن، سەری پلاو هیچی لەسەر نابێت، هەندێکی لێدەخۆن وازدێنن، خوانچەکە دەگەڕێتەوە، گۆشتەکەی ژێرەوە نەخوراوە، دەڵێت: ئەگەر نەدا مەعبوود...

* ئەم پەندە بۆ کەسانێك بەکاردێت، هەر هەول بدەن، لەبێهیری بە ئاوات نەگەن .

### 12–ئەم شەو، شەوی گا سوورە .

لە گوندێکی کوێستانی ئەم سەرەوەدا، پیرەمێردێکی کەژناسی حیسابگر هەبوو، ئێوارەیەك هەر دەهات و دەچوو، یەکێك لە نەوەکانی لێی پرسی باپیرە بۆ دانانیشی، قسەی خۆشمان بۆ بکەیت .

باپیرە: ڕۆڵە، ئەم شەو شەوی گا سوورە، بڕۆن بیهێنن، بیکوژنەوە، هەتا بەیانی نووستن بۆ پیاوەکان نییە، شەوی بەفر ماڵین و گۆشت خواردنە، بە نۆرە بەفر ماڵ بگرنە دەست، سەر بانەکان پاك بکەنەوە، کاتی پشوودان بەردەوام گۆشت بخۆن .

شەوی کرد و بەفرکرد، کەلێنی نەدا، کە بەفر لێی کردەوە، هاتنە دەرەوە، خەڵکی ئاوایی هەموو بەژێر بەفر کەوت بوون، ئەمن و تۆ خۆش، لەو ڕۆژەوە بووە بە پەند، شەوێکی سەختی چلەی زەنەکە بەفریٚ هەیە پێی دەڵێن، شەوی گاسوور .

* ئەم پەندە کەسێکی خاوەن ئەزموون دەیڵێت، بۆ خۆ ئامادەکردنە بۆ بارێکی سەخت.

## 13–ئەوەش بووە فشە .

دەڵێن شوانەوێرەیەکی ئەم دەشتی هەولێرە، بە دەگمەن ئاوەدانی دیت بوو، بە دوای مەڕداری خەرێك بوو، پیری دەستی لێستاند، لە نەریتی ئۆلی ئاوەدانی نە دەزانی، لە گوندێکی خزمەکانی جێگیربوو، ڕۆژێك چووە مزگەوت نوێژ بکات، کەچوو نوێژ دابەسترابوو، هیچی لێنەزانی گوتی: ئەوەش...... .

* ئەم پەندە کەسێك دەیڵێت، لە نەریتێك نەزانیٚ، خۆی پێوە ماندوو نەکات، فێری ببێت .

## 14–ئەوە چییە؟ ئاغەی گۆتیە هەڵلایە .

ڕۆژێك کابرایەکی دەشتەکی بە هەلەداوان خۆ دەگەینێتە ماڵی برادەرێکی باوەڕپێکراوی خۆی لە پەستیان چاوەکانی چوو بوونە پشتی سەری، مووەکانی ڕیشی گڤ ببوونەوە.

خاوەن ماڵ پرسی: ها هاوڕیٚ، چ بووە؟ چ ڕووی داوە؟ زوو پێمبڵیٚ بەڵکو بتوانم یارمەتیت بدەم.

کابرای هەلەشە دەڵێت: ها، ئەمن چ نازانم، ئاغەی لەسەر سەکۆی دیوەخانی گۆتی: هەڵلایە.

* ئەم پەندە بە کەسانێك دەڵێن سەربەخۆ بە قسەی یەکی تر خۆ هەراسانی و پەست بکات.

## 15–ئەو بارەی لەمنە، لەقاتر ـ ئێستر ـ یش بی دەتڕی.

ڕۆژێك کابرایەکی کۆڵ هەڵگر بارێکی زۆر گرانی بە شانەوە بوو، وزە و تینی لەلاشەدا نەهێشت بوو، دەمارەکانی شل کردبوونەوە، خۆی پێنەگیرا، بایەکی لێبەر بوو، دەنگەکەشی چوار دەور گوێبیست بوون، منداڵێك لە تەنیشتیەوە گوێی لێ بوو، دایە قاقای پێکەنین، کابرا لەژێر بارەکەوە گوتی: ئەو بارەی لەمنە لەقاتریش بی دەتڕی.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن کارێکی لە توانای خۆی گەورە تری پێ سپاردرابێت بەباشی پێی هەڵنەسووڕێت.

## 16–.ئەو بنملانە پێك دادە، سۆڤ سمایل سووتا!

حاجی قادری سمایلی، برای مەلا سالحی کۆزە پانکەی، پاش سووتانی گوندەکەیان دێتە هەولێرێ دەچیتە مزگەوتی، سەیر دەکا مەلا سالحی برای دانیشتووە، کۆمەلە کتێبێکی گەورە گەورەی لە چواردەوری خۆی داناوە، لێیان ورد دەبێتەوە.

حاجی لەناو کارەسات هاتوو، سەرو سامانیان بەتالان چوو دەڵێت: ئەو بنەملانە پێك دادە...... .

* ئەم گۆتەیە هی حاجی قادرە، بەر ئەدەبی میللی دەکەوێت، هەر چەند نێوارێکی تەسك لەنێوان ئەدەبی فۆلکلۆری و میللی لە کوردیدا هەیە.

* ئەم پەندە دوو جەمسەری هەیە: یەکیان یەکێك جەرگ سووتاوبی، ئەوی تریان لە ناو کارەسات بژی گوێ پێنەدات .

## 17-.ئەوی لە ماریٚ بابت سمیت، لێرەت بسمیبووایە، ئەوی لێرە دەسمی لەوێت بسمیبووایە .

کچێك لە تەمەنی هەرزەکاری سەرخۆشی هەرزەکاری دەبێت، ئەوی لە کچ پێویستەو دەویسترێت نایمینیٚ، کچە شوو دەکات، شەو لە ماڵی خەزووران دەبیتە چ بوو، چ بوو. خەزوورەکەی مریدێکی خوایی بوو، لە ڕاهی خوای خۆر بە سەری کرد، وەرز لە دوای وەرز هات گەیشتنە نێرینەی بەهاریٚ، نیوڕانەیەك خەزوور لە مزگەوت دەگەڕێتەوە، دەبینێت، وا بووکەکەی لەو نێرینەی بەهارەدا لەناو گیای دانیشتییە لەگەڵ خزمێکی کەپووی دەسمی، خەزوورەکە سەری بادا گوتی: کیژم ئەوی لە ماری بابت سمیت... ئەوی لێرەت دەسمی لە...... .

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن کاری بنەڕەتی لەکات و ساتی خۆی نەکات، پێیەوە شەرمەزاربێت .

## 18-ئۆخەی تڕا خۆم و سڕا خۆم، لەبن کەچە بەڕا خۆم.

پیرێژنێکی دەشتەکی ئاراسانی لە کوڕەکەی هەڵدەگرێت، هەر دەیگۆت: دەمەوێت سەربەخۆ بم، ماڵۆکەی خۆم هەبێت، کوڕە دەڵێت دایە ماڵ هەموو ماڵی خۆتە، ئەوەت لەچی؟!

ڕۆژێك كوڕە بێزار دەكات هۆدەیەكی بۆ جودا دەكاتەوە، شەو چاوە دیری دەكات لەكولانكە دەبینی دایكی دەچێتە ناو جێی بایەكی لێبەر دەبیت دەڵێت: ئۆخەی تڕیٚ خۆم سڕی خۆم لە.... .

* ئەم پەندە بە كەسێك یان خێزانێك دەگوترێت بییەوێت سەربەست بێت، كەسانی تر نهێنی نەزانن.

## 19–ئێرە جاستانە، كیستان نییە .

جاستان گوندێكە لەخوارووی هەولێر، لە ڕۆژهەلاتی دیبەگە، سییانەتی نشینە. كورد دەڵێت: زستان یان سەر وەشینە، یا ن دوا وەشینە، ساڵێكی زستان دواوەشین بەفرێكی ئەستوور دەبارێت، مەڕو مالاتیان قڕ دەكات، ئالیكیان نامینێت، كابرایەكی مەڕدار دێتە دەرەوە پاكەتێكی بە ئاسمانی وە دەنێت دەڵێت: ئێرە جاستانە، كیستان نییە.

* ئەم گۆتەیە بە كەسێك دەگۆترێت، كاری لەشوێن خۆی نەكات .

## 20–ئیشی ئەوڕۆ، مێخە سبینیٚ .

دەگێڕنەوە، دەڵێن كەروێشكێكی تەوەزەل هەبوو، تلیشە بەردێك لەبەر دەرگای ماڵیان كەت بوو، هەركی بەوێدا تێدەپەڕی ساتمەی لێدەكرد، هەموو جار دەیگۆت بەیانی، ئەم تاشە بەردە لادەبەم، دەرو دراوسیٚ، دەرو دراوسیٚ لێهەردەزلن، ڕۆژێك مام ورچ بەویٚ داچوو، ساتمەی كرد، بەربووەوە، كەروێشك نیوە گیان بوو، كەروێشك وتی، ئیشی ئەوڕۆ، مێخە سبەینیٚ.

* واتە هەر ئەركێكت هەبوو لە كاتی خۆی ئەنجامی بدە، دوای مێخە .

## 21–ئێە، چرگەك، مرگەك.

ڕۆژێـك كابرایـەكی كـراس شـۆڕی ئـەو دەشـتی قەراجـە، دەچـیتە سـەردانی شـكارتەكەی، لـەناو قۆپەنـە دەغلێـك چـاوی بـە چـرگێكی نـەخۆش دەكـەوی تەورزێنێكی ڕادەوەشینتێ شلپ ئەو بەستەزمانەی بەیەكجاری نیوەگیان دەكات بە پەلە زوو سەری دەبڕی، دەیباتەوە، دەیخۆن .

هەموو ڕۆژ تەورزێنی دەست دەدایێ دەچووە ناو شكارتەی لێیاندەپرسی خێرە؟ دیگۆت: ئێم چرگەك مرگەك.

* ئەم پەندە بە كەسێكی كەلك بەخش دەگوترێ، كەلكی لە شوێنێك دیتبێ .

## 22–بابی بابم سەید ئۆمەر.

سەید ئۆمەرێك هەبووە، بەناوی سەیدایەتی خەڵكی سادەو ئاینینی گوێیان لێڕا دەگرت گوایەوجاغزادەیە. سەید ئۆمەر لەوانە نەبوو ئەم ڕێزە ڕابگرێ، هەر قسەیەكی بۆ هاتبێ نەیگێڕایتەوە، چ بەدرۆ، چ بە ڕاست، هەتا گەیشتە پلەیەك درۆی پتر بووە لە خەڵكەكە چاكیان ناسی بوو، قسەی ڕاست لای ئەو نییە.

* ئەم ڕستەیە بۆ پیاوی درۆزن بەكار هاتووە.

## 23– بابی من كەتو مۆت.

جارێـك عـارەبێكی سـەر سـنووری گەرمیانـە، میـوانی كابرایـەكی كـوردی برادەری دەبێ، ئـەویش نـانێكی چاكی بۆ ئامادە دەكات، ئێوارە لەسـەر نـان خواردن كابرای كوردە دەكەوێتە ئاخاوتن و چۆنیەتی مردنی باوكی دەڵێت، باوكی خوالێخۆشبووم نەخۆش كەوت، زۆرمان خزمەت كرد، بەلاگێڕمان بۆ كرد، خوا نانی بڕی بوو، ئەنجام چووە جیهانی نەبوونیەوە، كوردە سەیری لەنگەری كرد، هیچی تێدا نەمابوو.

كابرای كوردە گوتی، ئەدی باوكی تۆ چۆن مرد؟

عارەبەکە تێگەیشت مەبەستی چییە؟ گوتی یا برایێ من ، بابی من کەتو مۆت، دوا پاری لێدا تەواوی کرد.

* ئەم پەندە وەڵامدانەوەیە کەلە مەبەستی قسەکەر بگات.

## 24- بارانە مەوارە، شیووشیو بڕۆن.

هەندێك لەکی خێلەکی باران نەیدەهێشت بارکەن، یەکێکیان دەڵێت ئێوە بارکەن من دەچم خوا دەغافڵێنم چەند قلە قەسپێك دەست دەداتێ، دەچێتە سەر گردێك دەڵێت بارانە مەوارە، شیوشیو وەڕۆن.

* ئەم پەندە بە کەسێکی زۆر سادە دەڵێن، بیەوێت فێڵ لە یەکێکی زۆر بەتوانا بکات.

## 25- بار- ماڵ - ی کوردی هەر لەسەر پشتی کەرێیە.

زۆر پێدەچێت مێژووی ئەم گۆتەیە بۆ سەردەمی کێشەی فورس و ڕۆم لەسەر خاکی کوردستان بێت، ئەم دوو نەتەوە دراوسێی کوردە، لە دوورە دەستی دەسەڵاتدارانی ئیسلامو بێهێزیان، هەموو بینەو بەردەیەکیان لەپێناو یەکگرتنەوەی گەلەکەیان و ڕزگار بوونیان بەلاوەنا، بەوەش نەوەستان کەوتنە داگیرکردنی خاکی کوردستان، هەر یەکەیان بەشێکی دابڕی لە بێهێزی کورد هەندێکیان مەزهەبی شیعەی هەڵبژارد، بەشێکی زۆریشیان بوون بە سوونە، ئەم سوننەو شیعەیە بۆ کورد نەخۆشییەکی کوشندە بوو، سەروسامانی کورد بەم نێوانە بەر تالأن دەکەوت، لەم تێڕودۆیە کورد هەر لە ڕاونانو تالأن کردن دابوو، یەکێك گۆتیتی: باری کوردی هەر لەسەر پشتی کەرێیە.

## 26- بالوولی بەغدایێ، ڕازی بوو بە کایی، بەرباشیان نەدایێ.

بالوول لە فۆلکلۆری کوردی برای هاروونە ڕەشیدە، زۆر بایەخی بەم جیهانە نەداوە، هەردەم بیری لەجیهانە هەرە بەرزەکە کردۆتەوە، بەشتی زۆر ڕازی بووە، لەبەر ئەوەی خراپەی نەکردووە، دەسەڵاتی بەدەستەوە نەبووە، ئەوەندە بایەخیان پێنداوە، داواکارییەکانی جێبەجێ نەدەکران.

* ئەم پەندە بەکەسێکی ڕاست و خوایی دەگوترێ لەبەر نەبوونی دەسەڵات بەدەستەوە گۆیێ پێنەدرێ.

## 27-ا- بەتەوە جوهەکی هەمووم لێخڕبوونەوە، بە بایەکی هەمووم لێڕەوینەوە.

## ب- بەهووەك گرد، بە تڕەك بڵاو.

دەڵێن شێخ ... شارەکەی خۆی بە جێدەهێڵێ، دێتە شارێکی دی، باوەڕی شێخایەتی خۆی بەناو دەروێش و خەڵکەکە بڵاو دەکردەوە، خەڵکەکە بە هو، هو، دوای کەوت بوون. شێخ بە ئەزموونی دەروێشەکانی جارێك دووجار ئەو تەنگژەی لە سکیدابوو، نایهلێتەوە، دەروێشەکان بەتەواوی گوێبیست دەبن، چفتە چفت پەیدا دەبێ، وارە وارە خەڵکەکە لێی سارد دەبنەوە، پشتی تێدەکەن.

شێخ دەڵێت: بەتەوەجوهەکی...... .

* ئەم پەندە، کەسێکی زیرەك، بە کۆمەڵێکی کەمزانی، چاولێکەر دەڵێت.

## 28- بەخۆم ڕووس نیمە، هاگاشم لە زۆمێ نییە.

کوتار فرۆشێك لەم شوێن بۆ ئەو هەردە دەگەڕا، گەیشتە ناو هۆبە ڕەشماڵێك، دیتی ژنێك لای سەرپەڕگە، چارۆگێکی بووزی دڕاوی لەخۆ لوولدا بوو.

کوتارفرۆش دەست دەکات بە: هۆی کوتاڵ، هۆی کوتاڵ، ژنەکەش لێك لێك مەشکە دەژینی.
کابرای کوتار فرۆش: ئەریٚ خوشکم کوتاڵی ناکڕن؟
ژنەکە: بەخۆم ڕووس نیمە هاگاشم لەزۆمیٚ نییە.
* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن پێویستییەکی هەبێت، بایەخیشی پێنەدات، بیباتە سەر.

## 29– بەسەروەری بە پەروەری تەواویان نەکرد، جۆرکی کەریٚ.

هاوچەشنی چیرۆك و ناوەرۆکی ئەم پەندانە، لە دەقەکانیان دیار دەکەوێت، سەروەو پەروەر، هەردووکیان نیوەی یەکەم تەواو دەکەن، نیوەی دووەمی پەندەکە دروستکردنی جۆرکی ئالیکی کەرێیە.
پەندبێژ دوو ئافرەت قیت دەکاتەوە، ئەگەر ژنێك بووایە دەبوو، لەبەر پشتە پەشتیماڵەوە پێرا نەدەگەیشت دەبوو، ئەوە دووانن، تەوەزەلی نەبیٚ، کارێکی سادەی زۆر ئاسانە پێیان تەواو نەکراوە.
* ئەم پەندە بە کەسانێکی نەکردەو بێتوانا و تەمبەڵ دەڵێن.

## 30– بەسمخڕیٚ و بە قوز خڕیٚ، کەلکی شکارتەکەیان بڕیٚ.

کابرایەکی دەشتەکی ، کچێك و جاشماکەرێکی هەبوو، شکارتەیەکی کردبوو، ساڵەکە هاتێکی باش بوو، زۆری ئومێد بەشکارتەکەبوو. کچەکەی دۆستێکی هەبوو، هەموو ڕۆژیٚ سواری جاشماکەری دەبوو، لەویٚ تەوێکی لە شکارتەکە دەدا جاشماکەریٚ. خۆیشی لەگەڵ کوڕە دۆستەکەی دەکەوتنە ڕابواردن، شکارتە ئەوی خورا، ئەوی لە بەر پێیان پانکراوە.

ڕۆژێك خاوەن شكارتە دەچێت سەردانی شكارتەكە بكات، دەبینی هەست دەكات، لە تەپلی سەری خۆی دەدات، خەڵكانێك لێی دەپرسن، ها خێرە؟
خاوەن شكارتە دەڵێت: بە سمخڕیۆ بە قوز خڕی كەلكی شكارتەكەیان بڕیۆ.
* ئەم پەندە بەكەسێك دەڵێن باشی بۆ هاتبیۆ، لەبەر بێباكی خۆی كەلكی لێنەبینێت.

**31–بەشی لاوان، هەر بۆق خواردنە – پیشە –**

شینە شاهۆ لەگەڵ كازیوەی بەیانی، جیهان ڕووناك بوو، دەچێتە سەرداریێكی بڵند، سێبەری خۆی دەبینێت، زۆر دڵی بەسێبەری بەژنو باڵای خۆ دەهێت، دەڵێت من ئەو گیانلەبەرە بم لەمڕۆوە چی دی ئەو خواردنانە لەمن ناوەشێتەوە و شایستەی من نینە. ڕۆژ بەرز دەبێتەوە، هەتا سێبەری دەكەوێتە ژێرە خۆی، برسیش دەبی، دێتە خواریۆ دەنیشیتەوە ناو زەلكاوی، دەڵێت بەشی لاوان هەر بۆق خواردنە.
* ئەم پەندە بەكەسێك دەگۆترێت بیهەویت لە پێستی خۆی دەربچێت بۆی نەچتە سەر لەتوانایدا نەبێت، بگەڕێتەوە بۆ سەر نەریتی باوی پێشووی.

**32– ا– بەفێران ، بەفران ، سۆرێم لێستاند، لۆ كوڕان.**
ب– برێنە پیرە ئامانیۆ هەر سیۆ مانگی زستانیۆ لاقم بردە عاسمانیۆ، گریمان بۆرە نە هاتەوە لە گاڕانیۆ.

پیرەمێردێكی بە ساڵا چوو هەبوو، ژنەكەی نەخۆش كەوت، چەند ڕۆژێك لەناو جێوبالینگانیدا مایەوە، چووە جیهانی نەبوونییەوە، كوڕێك و كچێكی

لەدوای بەجێما، چەنداوێکی پێچوو پیرە مێرد بای تێوەستا، باوەژنێکی تەلەکەبازی بۆ پەیدا کردن، باوەژن کوڕێکی لاوی لەمێردی بەرایی هەبوو، کوڕە لێی زویر بووبوو، وازی لەدایکە مێرد کەرەوەکەی هێنابوو. زڕدایکی ئۆینباز بۆ ئاشت بوونەوەی کوڕەکەی، خەباتەی ئەوە دەکات، ناسکەی زڕ کچە نازدارەکەی بداتە کوڕەکەی مێردی پێشووی، بنەوانێکی بۆ پەیدا بکات، خۆی لەبەرچاوی پیرەمێرد شیرین دەکات، بە ئارەزووی خۆی دەیخوێنێ، ڕۆژێك مەبەستەکەی لەمێردە گەیاند.

مێردە لاری نەنواند، ژنەکە زانی ئۆینەکەی سەری گرت، بەخۆی نەوەستا لە ڕووی مێردەکەی گووتی، بە فێران، بەفڕان، سۆرێم لێستاند لۆ کوڕان.

باوکی کچە کەزانی زڕ دایك هەلەیەکی زەقی پێکردووە، بایداوە گوتی، برێنە پیرە ئامانیٚ هەرسیٚ مانگی زستانیٚ، لنگم بردە عاسمانیٚ، گریمان بۆرە نەهاتەوە لە گاڕانیٚ.

## 33– بەکەفەری سپی نەگەڕاوە، بە دەسکە پووشان ناگەڕێتەوە.

دەڵێن مەلای مەشوور، کچێکی جوانی هەبوو، کچە دڵی کەوت بووە سەر کوڕێك، باوکە لەسەر دارێکی بە پەلك خۆی مات کردبوو، سایێدی کچەکەی دەکرد، کچەو کوڕە لاسایی گیانلەبەرانیان دەکردەوە، خۆیان کردبوو، بە جوانە ئەسپو جوانە ماین، کوڕە غارغارێنی دەکرد کچە دەسکەپووشێکی بۆ ڕاگرت بوو، کوڕووش، کوڕووشی لێدەکرد.

باوکە لەسەر دارەکەوە بانگی کرد: بە کەفەریٚ سپی نەگەڕاوە، بەدەسکە پووشان ناگەڕێتەوە.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن، بەشتێکی کەم، کارێکی گەورە چارەسەر بکات.

### 34–(نەمیم) بەندکار کەرو جۆی لێك دەکا.

بەندکار– بەدکار– دەچێتە کن کەرێ دەڵێت، تۆ ئەوەندە بارەت لێبار دەکەن تۆ شایستەی ئالیکی برنجی، جۆ چیە ئالیکی تۆ بێ، دەچێتە لای جۆش دەڵێت، تۆ گەلە لەوە بەهادارتری ببیە ئالیکی کەرێ!

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن بەدکاری و نەمیمی بکات.

### 35– بزن تارەتی هەر ناگری!

ڕۆژێك کابرایەکی ڕاواندزی بزنێکی بەدیاری بۆ پاشای کۆرە دەبات، دەگاتە ڕوباری کاولۆکان دەیەوێت تارەت بە بزنەکە هەڵبگری، بزن لەئاوی دەهاتە دەر دەیپیڕاند، یەکێکی دەکێشا، پاشای کۆرە لە دوورەوە دەیبینێت دەڵێت: بزن تارەتی...! ئەم چیرۆکە خاوەنی بزنی نادیارە، پاشای کۆرە، ڕوباری کاولۆکان ئەدەبی میللییە. ئەم پەندە لە کوردستان بلاوە، ئەم زارو ئەو زاری کردووە، کاکلەی فۆلکلۆرە، ڕووداوی وەك یەك پەندی نزیك لەواتا دروست دەکەن.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن لەسەر یەك ڕێچکە نەڕوات زوو خۆ بگۆڕێت.

### 36– بزنێ پۆش ئەمن و تو خۆش، بزنی بەلەکار لەوێ بوو مردار، بزنی بەلەمس هەر لێی مەپرس.

دەشتەکییەك سێ بزنی بەنوەکاری دابووە ناسراوێکی، نەبوونی ئەگەر بەسەریدا زاڵ نەبی زۆر شتت پێدەکات، پاش چەند ساڵێك خاوەن بزن دەچێت بۆ لێپرسینەوەو بەراودکاری.نیوەکارەکە دەڵێت: بزنی پۆش ئەمن و تۆ خۆش، بزنی بەلەکار لەوی بوو مردار...

* ئــەم پەنــدە، کەســێك دەیلێــت لەبــەر نــەبوونی، خــواردبی، ئــەنجامی بەهیچەبێت.

## 37– بشفڕی هەر بزنە.

دەگێڕنەوە دوو هاوڕێ بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن، تارماییەك لەدوورەوە بەدی دەکەن، ڕەش دەچوو، یەکێکیان گۆتی ئەوە بزنە، ئەوی تریان گوتی نا قەلە ئەوی تر هەر سوور بوو دەیگوت بزنە، نزیك بوونە قەلە فڕی، برادەرەکە گوتی: بشفڕی هەر بزنە.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن پێلەکە لەسەر هەلە بکات.

## 27– بووە فشەی بنەسراوەی.

نزیکی لە شاری هەولێر، گچکەیی گوندەکە، نەبوونی ئاغەو کێخوا، نەبوونی دیوەخان، تێکەڵاوی لەگەڵ شار، نەشاری بوون، نەگوندی بوون، کەشاییەك دەبوو، نەریتی باو تەواو نەبوو، هەر کەسەو بۆ خۆی دەستی چەند برادەرێکی دەگرت هەڵدەپەڕی خەڵکەکە ئەمەیان بە شتێکی سەیر دەزانی، چونکە لەسەر ڕێوشوێنی کوردانە نەبوون ئەنجامی کارەکەیان فشەبوو، بۆیە دەڵێن، بووە فشەی بنەسراوەی

* ئەم پەندە بەکارێك دەگۆترێت بە نابەجێی بکرێت.

## 38– بووە نووشتی قەشەی!

منداڵە موسڵمانێك هەموو شەو فێر بوو بوو میزی لە بنەخۆی دەکرد، بڕمیزبوو، دایکی چەند نووشتەی لای مەلا بۆ کرد، سوودی نەبوو، منداڵەکەی چاك نەبووەوە.

ڕۆژێك دایكی لە عەبدەیییان چووە لای مام قەشەی ، نووشتەیەكی بۆ كرد، ئەم شەوە لەجیاتی میز خۆی پیس كرد.

* ئەم پەندە بەكەسێك دەڵێن بیەوێت، كارێكی باش بكات خراپتری بەسەر بێت.

## 39- أ - بووكێ پێ لە ڕكێیێ، نازانی نسیبت بۆ كێ؟!

## ب - بووك لەسەر زینی ، یا ڕسق و یا نسیب.

خۆشەویستی سنوری نییە، هەژاری و پایە، نابیتە كۆسپ، دەڵێن لەم سەرەوەی هەولێرە لە دێیەك كوڕە هەژارێك هەبوو، ئەوی خودا دابوویە خەڵكی ئەو نەیبوو، دڵی كچێكی دەوڵەمەندی گرت بوو، كچەش خولیای خۆشەویسی وی كەوتبووە سەر.

ساڵ هات و ساڵ چوو، كچە داخوازی دەهات، پەڵپی دەگرت شووی نەدەكرد، بەهیوای ئەوەی خوا دەروازەیەكیان بۆ بكاتەوە، ڕۆژێك لەخۆ بێزاربوو، ڕاسپێرێكی نارده لای كوڕە یان بمخوازی یان وازم لێبینی، كوڕە وەلامی بۆ ناردەوە: بەخۆی دەزانی ماڵە نییەتم، خوشكە نیتم، خودا بە خەڵكی داوە، بەمنی نەداوە، نیتم، بە ئارەزووی خۆی بكات.

كچە ئەو جارە داخوازیكەری هات، دڵخۆشی خۆی نیشاندا، بە دەسگیران كرا، چوون بۆ جلكان، كەلوپەلی بووكینێ بۆ كڕا، ڕۆژی دوو شەممە داندرا بۆ گواستنەوەی بووكێ. جاران جوولەكە سەری ولاغی بووكیان ڕادەكێشا، بەم دواییە كەسێك لەخزم و خۆیشانی زاوا شەرمی بەخۆ نەبووایە، یا پیاوێك بڕكۆكەك سادەو بێباك بووایە.

شەوی پێش گواستنەوە، كوڕە ئارامی لێ هەڵگیرا خۆی گەیاندە خدرۆكە جووی گووتی: تكات لێدەكەم لە ڕێگا خۆت نەخۆش بێخە، من لە جیاتی تۆ

سەری ولاخی بوکیٚ ڕادەکێشم، ئەتو لەجێی من سواری کەرە دێزەی بە، ئەتو هەر لەسەر بەخشیشی خۆت بە.

کچە بۆ بەیانی ئارایش کرا، زۆر جوان ڕازایەوە، سواری جوانە ماینیٚ شیٚ کرا، جووە چوو سەری ڕاکێشا، لەگوندی دەرچوون، سوار سوارانیٚ دەستی پێکرد، لەشوێنی نیشانەکراو جووە خۆی لەخۆ برد، یان خۆی هێنا مەلاییٚ.

گۆتە گۆت پەیدابوو، کیٚ سەری بووکی ڕابکێشیٚ؟ جووە بە کوڕەی کۆنە دۆستی بووکێی گۆت تو سەری ڕابکێشە، کوڕە ئامادەبوونی خۆی نیشاندا، جووەو کوڕە ئاڵوگۆڕیان کرد، هاتن گەینە ڕاستی خاروان و ڕەشوانیٚ دەستی لەبنا گوێنا ئەم حەیرانەی خوارەوەی گۆت:

حەیران... سبەینە، سبەینە سارە.

لەسەرو پەرچەمیٚ نازدار حەیرانیٚ کەتییە هووردە خوسارە.

کاکلاغەی گەردی دەستم ناتگاتیٚ، سەیدە حمەدی مار لە ڕەشوانیٚ هاوارە.

سەید حمەدی ڕەشوانیٚ لەدیوەخانیٚ دانیشت بوو گوتی: کوڕینە سواری ئەسپان بن، ئەو هاوارە بۆ من بوو، سەیدە حمەد چووە بەرا سواران گوتی: کیٚ بوو پێش ماوەیەك ئەو حەیرانەی گۆت، هێنایان و بردیان، گۆتیان : ڕاستییەکەی ئەو کوڕە هەژارەیە، سەری بووکیٚ ڕادەکێشی، سەید ئەحمەد کوڕەی جوداکردەوە، کوڕە بەنهێنی هەموو شتی تێگەیاند.

سەید حمەد ڕووی لە خەڵکەکە کرد، دەبیٚ قاوەیەك لەدیوەخانی من بخۆنەوە، هەرچەندی خۆیان بادا، درەنگە، چاوەنواڕن، خێرادادی نەدا، خورتی لێکردن، چارە نەما بەربووك و بووکیان بردە ماڵی سەیدە حمەدی، بەقاوەچی گۆت برەك خۆ دوابێخە، سوارێکی بەدزی ناردە دوای زاوای، زاوا هات بردیانە ماڵی.

سەیدە حمەد چوو بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکرد گوتی: ڕۆڵە ئەو کچەی توخوازبینیت کردووە، کاتی خۆی دڵی بە یەکێکی تر داوە، بە کەلکە تو نایی، بەکەڵکی ئەو کەسە دێت دڵی پێداوە، ئەو کیژانەش دانیشتوون، کیژی گوندینە، کامیانت بە دڵە؟ لێت مارە دەکەم، بەرگی بووکینی لەبەر دەکەین، منیش نەختەکەی دەدەم.

کوڕە دوای گەیشتە ئەنجام یەکێکیانی لیٚ هەڵبژارد، سەیدە حمەد لەدوای مەلای گوندیو باوکی کچەی نارد، هەموو شتێکی جێبەجیٚ کرد، بەرگی کچەیان لەبەر بووکی کرد، بەرگی بووکیشیان لەبەر کچە، بووکی نویٚ کرد، ئەو گۆڕانکارییە کراوە تاکولۆك ئاگادار کرابوون. ئێوارە سەیدە حمەد کوڕەی ناردە پالٚ خۆشەویستەکەی، ژێر پەردەوە، بەیانی کردیە ڕەنجبەری یەکێك لە ئاوایی، ئەوەیە بووك لەسەر زینی یا ڕسقو نسیب.

سەردەمی سەرمایە ئەو جۆرە نەریتانەی گومە شێر کرد.

## 40- بووکی ساریٚ، گۆلکی ساریٚ ، بزربوون ، لە شاری هەریری.

کابرایەکی هەریری لەکاتی خانزادی سۆراندا، کیژێکی تازە پێگەیشتی ژیکەلەی زۆرجوانی لادێی شەرمنی بۆ کوڕە تاقانەکەی خواستو گواستەوە.

ڕۆژێك گۆلکێکیان هەبوو، بەردەبێت، بووکە بەدوای دەکەوێت ژنە دەگەڕێتەوە بەمالٚ ناکەوێتەوە، لەم ڕۆژەوە بووە بە گۆتەیەك، دەڵێن بووکی ساریٚ، گۆلکی ساریٚ، بزربوون..... بووکی تازەی شەرمین، ژیانیان گۆڕانی بەسەردا دێت، زوو لێیان تێکدەچێت، گۆلکیش بەربێت، بای لەگویٚ بدات، ڕاست چۆلی بەغار دەگرێتەبەر، تاهێزو توانای تێدابێت، هەر ڕادەکات، تا پەکی دەکەوێت، چارەی نامینێت ڕەق ڕادەوەستێت.

* ئـەم پەنـدە ئاماژەێیکـە بـۆ ئـاوەدانی شـاری هـەریر و بەمەبەسـتی نەشارەزایی دێت.

## 41-بـووکی مـام وەسمـانی، بـە ڕۆژ دەچـتە کـۆرانی، بەشـەو دەچـتە قەزوانی.

ڕووداوی ئـەم چـیرۆکە، لـە چـۆنیەتی داڕشـتنی پەندەکـەو دیـاریکردنی کەسایەتییەکان بە دەر دەکەوێت.

مام وەسمان و بووکی مام وەسمان زاڵن بەسەر دەربڕینی پەندەکە، پەندەکەش لەسەر کارنەکردن، کاری ناڕەوا لەشوێنی خۆی نەبی، مام وەسمان نازانرێ کێیە، بۆیە بەر فۆلکلۆر دەکەوێت.

## 42- بوویتە گورگی کەنعانی.

ڕووداوی ئـەم چیرۆكو پەنـدە بـۆ کارەسـاتەکەی یـەعقوبی کـوڕی ئیـسحاقی کـوڕی حـەزرەتی ئیـبراهیم دەگەڕێتـەوە، یـەعقووب دوو ژنـی هێنـابوو، لـە ژنـی گەورەی (10 )کوڕی هەبوو، لە ژنی گچکەی یوسف و بنیامینی هەبوو، یوسف لەمنداڵییەوە زۆر زیرەك و چالاك بوو، باوکی زۆری خۆشدەویست.

یوسف منداڵ دەبێت، شەوێك خـەونی - رایت احد عشر کوکبا..... دەبینێت باوکی پێی گوت ئەو خەونەی بۆ کەس مەگێڕەوە.

یوسـف هـات بـووە مێـر منـداڵ، زڕ براکـانی زۆر لێـی داخـدار بـوون، ڕۆژێـك گوتیانە باوکی یوسفی برامان لەگەڵ خۆمان هەر دەبەینە ڕاوێ، ئەویش بەسەر زاری داهـات، گـوتی: گـورگ دەیخـوات، قـسەکەی لـەزار دەرچـوو، پەشـێمان بـووەوە، لێـی بوونـە مـوی شـەیتانێ بردیـان، دووریـان خـستەوە، ویـستیان بیکوژن، برایەکیان گوتی مەیکوژن، بیهاوێنـە ئەو کۆنە بیرە، لەو چۆلەوانییە دەمرێت، فڕێیـان دا نـاو بیرەکە، گەڕانـەوە، کارەساتیان بەم شێوە بۆ باوکیان

گێڕایەوە: ئێمە ڕاومان دابەستی، ئاگامان لەخۆ نەما، گەڕاینەوە، گورگ یوسفی خواردبوو! !

یەعقوب ئەوەندە دڵگیر بوو، لەداخان هەردوو چاوی کوێر بوو، لەدوای گورگی دەڤەری کەنعانی نارد، هەموو سوێندیان خوارد، گووتیان ئێمە نەمان خواردووە، حەفت ساڵان گۆشت خواردنیان لەخۆ قەدەغە کرد، تا یوسف گەڕایەوە، باوکی شادبووەوە، باوکی چاوی چاك بووەوە، گورگی کەنعانیش تامەزرۆیان شکاند.

* ئەم پەندە بۆ کەسێك بەکاردێت، خراپەیەکی نەکردبێ بە زۆری بە ملی دابدەن، لەبەر ئەمە گۆ شیری لە شتەکە بکات.

43- ا - پاشام شێرەك لە بێشەی غەزرییە.

ب- پاشام قەل بەلا سمێرت ڕیاوە.

ج- هەی ناشوونەوار!

ئێوارەیەك پاش نان خواردن، پاشای شار لە کۆڕی جوامێران، بێخوکاو دەدوا، دنکە برنجێکی بە لاڕیشەوە، سمێڵەوە بوو، سەرنجی کوڕەکەی ڕاکێشابوو. میوانێك لە دیوەخانەکە دانیشت بوو، بلیمەتانە گوتی پاشام شێرەك لە بێشەی غەزرییە. پاشا لەسەرەخۆ دەستی بە سمێڵو ڕیشەکەی داهێنا، لایبرد، پاش چەنداوێك میوان هەڵسا ڕۆیشت، پاشا گوتی: سەیرکەن ئەو میوانە چەند دانابوو، ئێوە هیچتان ئاماژەتان بۆ نەکردم، تا دنکە برنجەکە لابەرم.

یەکێك: پاشام ئەمجارە سەیری خولامی خۆت بکە، شەوێك و دووان، پاشا لا سمێڵی چەور دەبێ، کابرای خۆ هەڵکێش دەڵێت: پاشام قەل بە سمێلت ڕیاوە

پاشا: هەی ناشوونەوار.

## 44- پەڕی دەرکرد!

دەگێڕنەوە لە ڕۆژگارێکی زۆر کون، پیرێژنێکی پەککەوتە هەبوو، پیرێژن بە شیوی هەینی و یارمەتی ئاوایی دەژیا، چەند مریشکێکی ڕاگرت بوو، بۆ خۆی سێبوری پێدەهاتن، کابرایەکی بەدفەڕی ئاوایی بە مریشکەکانی فێربوو، تاقی لێبڕین، ئەویش پەڕی دەرکرد.

## 45-ا- پڕ دەبێتەوە جێی خەنجەران، پڕ نابێتەوە جێی کەسران.
## ب-گشت برینەك دەرمانی هەیە، برینی زمانی دەردێکی بێدەرمانە.

دەڵێن کابرایەکی هەژار، لەخۆ بێزار، دەچێتە دارستانێك، دەشزانی شێرێکی لێیە هەرچی بچیتە وێ دەیکوژیت. شێرەکە چاوی پێدەکەوێت سکی پێدە سووتێت، ماوەی دەدات سەرفیراز بێت لەدارستانەکەی.
کابرا هەموو ڕۆژ خێرو بێری دارستانەکەی دەبردە شارو بەیانی دەگەڕایەوە، وای لێدێ، دەوڵەمەند دەبێ، لە پێستی خۆی دەردەچێت.
ڕۆژێك کابرا لەگەڵ شێرە برادەرەکەی لەتەك یەکتر دەنوون، کابرا دەڵێتە شێرەکە دەمت لابە، بۆنێکی ناخۆشت لە دەمی دێت، شێرەکە زۆر تووڕە دەبێت زۆری لێ دەکات، تەورێکی لە تەپلی سەری بدات، کابرا بیانو

دەهێنێتەوە چارەی نامینێت تەورێکی لە تەپلی سەری دەدات، مانگێك و دوان شێرەکە لاکە لاکەی لێوە دێت چاکەبێتەوە، دێتە لای پیاوەکە.
کابرا دەڵێت هاکاکە چۆنی؟!
شێرەکە دەڵێت پڕدەبێتەوە جێی خەنجەران، پڕنابێتەوە...........
* ئەم پەندە بە کەسێکی هەژار دەگۆترێت، لەسایەی یەکێکی تر دەستی بڕوات نەیهێنێ.

## 46-پیاو خوانانەکی دایێ، دەبێ بزانی بیخوا.

دەگێڕنەوە دەڵێن: کابرایەکی دەوڵەمەندی ئەو گەرمیانە، پیرە دایکێکی کتوکوێری هەبوو، لە ژوورێك بەتاقی تەنیا دەژیا.
شەوێك دایکە لە پشت سەری گوێی لە تەپەتەپێك بوو، خۆی کڕکرد، دزە شەبەقەیەکی لە ژوورەکە کردەوە، دزە لە سەرەخۆ خشی بێتە ژوورەوە، پێرێژن پڕی دایی جەمەدانی توندگرت، هاواری کرد، کوڕینە بمگەنێ،خاوخێزان لە سەری خڕبوونەوە دزەیان لە چوارمێخە کێشا، بەتەواوی بەرزەفتیان کرد، بە نهێنی ئاگاداری بەوکیان کرد.
باوکە چاوی بەدزەکەوت گوتی: ئەوە برادەرمە، دزنییە، وازی بە ئێوە کردووە، بەر بدەن بەرێزەوە دزەی بەڕێ کرد.
منداڵەکان گوتیانە باوکیان، ئەوە بۆ واتکرد؟ باوکە گوتی ڕۆڵەکانم ئەگەر ئەمە دز بووایە بە پیرژنە کوێرەیەك نەدەگیرا، پیاو ئەگەر خوانانێکی دایێ دەبێ بزانێ بخوا.

## 47- پیرو تەما کۆ ریشی کردم زەرد، ئەو یارەی دەمبرد بن برد و بن بەرد، ئێستا دەکۆکم دەڵێ قوزەڵقورت و دەرد.

کوڕیکی ئەو بەری وڵاتی کەرکووکە، زۆر کۆك و لێهاتووبوو، کیژ و کاڵی شوان و شێخ بزێنی ناوبانگیان بیست بوو، ناوکیان پسابوو بۆی، ناوی بووبووە ویردی سەر زاری نازداران، شەو بەئاوەتیەوە چاویان دەچووە خەو.
کچێکی نزیکی بەزەردەخەنەو نازوگۆزو چاوچاۆکێ، کوڕەی سەوداکر، خۆشەویستی لەنێوانیاندا پەیدا دەبێت کچە لەترسی بەدکاران پێناوی هەردەم لەڕێدابوو، تاکوڕە خوازبینی کرد و گواستیەوە.
کوڕە هات بە ناو ساڵ کەوت لە لایەك حەوکەحەوکی ماڵداری، لایەك تەمەن پەکیان خست، تووشی کۆکە هات بوو، ژنە جارجارە دڵی دەشکاند، ژنەکەی لەسەرخۆتربوو.
پیرەمێردی جیهاندیدە دەڵێت: پیری و تەماکۆ ڕیشی کردم زەرد، ئەویارەی دەمبرد... ئەم ڕووداوە دەتوانی دوو واتای گەورەی لێهەل بکرێنی:
یەکیان: پیاو ئەگەر پەکی کەوت، بێوەفایی ژنە، دووەمیان ڕەشبینی پیرەمیردی سەرداری ماڵە بێئومێدی نیشان دەدات.

**48–ا– تەماع بێتە گۆڕێ ، برای برای ناناسی.**

**ب–تەماع بێتە گۆڕێ ، گوجیلەی کوریتەکی یەکدی ناناسن.**

ڕۆژێك هاروونە ڕەشیدو بالوولی برای لە تەنگەبەری کۆڵانێکدا تێپەڕین، چاویان بەسێ گوجیلە سەگ کەوت، بە ئارامی و دڵنیایی سەریان بە یەکدی کردبوو.
هاروونە ڕەشید: ئەم گوجیلانە چەند تەباو ڕێکن؟
بالوول: هیچ تەماع و بەرژەوەندییەکیان لەنێواندا نییە.
بالوول: دەنێرێت پارچە گۆشتێکیان لۆ دێت، داوێتە بەر گوجیلان، دەبێتە شەڕە گوجیلە هەتا یەکتریان کەلموکلووم کرد.

* ئـەم پەنـدە بـۆ کەسـانێکی ئـارام بـەکاردێت، تـەماعێکیان بکەوێتـە نێـوان، لێکڕاست بین، زیان بەیەکتر بگەێنن.

## 49–وای لە سوڕی مالمی.

## ب– یا لە ڕێیە، یا لەجێیە، یا قەزیەتەی لێیە.

ژنە جووێك ماوەیەك بوو، مێردەكەی بۆ ماڵداری چوو بوو، نەگڕابووەوە، ژنە دەچێتە لای مالمی، بەڵکو سەرو سۆراغێکی بۆ بکات.

ژنە بە قوربانی سوڕی مالمی بم، دەبیٚ مێردەکەم مابیٚ؟

مالم پاش بیرکردنەوەیەکی کەم دەڵێت: یا لـە ڕێیـە؟ یا لـە جێیـە؟ یـا قەزیـەتـەی لێیە؟

ژنەکە لە خۆشیان، گوتی: بە قوربانی سوڕی مالمی بم ، وای لە سوڕی مالمی.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن بەکەسی بەرامبەریا بڕوای هەبی.

## 50– تفەنگی وی خالی، بەس دری من وە ناریٚ.

ڕۆژێـك کابرایـەکی کـوردو یـەکی عـەرەب، لێـك ڕاسـت دێـنو تێـك دەگیرێـن، کوردەکـە دەسـت دەداتـە تفـەنگی، دەسـت دەخاتـە سـەر پەلاپیتکـەو لوولـەی مـاهوزەڕی تێـدەکات، کـابرای قـوڕ بەسـەرجیٚ نـامێنیٚ خـۆتینیٚ! یـەك دوو نـاو بژیکـەر دەگـەنیٚ بـەکابرا دەڵـێن: ئـەتو بـۆ زراوت چـوو، خـۆ فیـشەك چییە پێـی نییە، ترساو دەڵێت: تفەنگی وی خالی، بەس دریٚ من قرار ناگری.

## 51–جارەکیش برین بەهی دایکـە نەخۆشـە، لـە بەرچـم نییـە، سـەرودرم پێی خۆشە.

لەمەزنە گوندێکی ئەو کرمانجەتییە، داپیرەیەکی نەخۆش هەبوو، هەر نکە نکی بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەبنسا،ماڵیان بو لێپرسینی چۆل نەدەبوو.
کێشتەنگاوێك بۆ سەردانی، کۆمەڵە کیژوکاڵێکی ئاوایی هات بوونە لای دایکە نەخۆشە دانیشتن، سەریان لەبەر سەری یەك نابوو پێدەکەنین.
دایکە نەخۆشە، لەسەرتان گەڕێم ، ئەوە بە چ پێدەکنین.
کچێکی تەوقەیان لەگەڵ دابوو، گوتی، داپیرە سەیری نێرەکەری دێزە بکە، چەند بێشەرمانە مارکاوکاولەکەی لە بنی سکی دەدات، هەر کەسە دەڵێت بەهەسانەکەی توو.
دایکە نەخۆشە: جارەکیش بڵێن بەهی دایکە نەخۆشە، لەبەر چیم نییە........
.

## 52- جاریٚ ئەو کوڕەی گەورە بکە.

لەم کوردەوارییە، جاران لەبەر پڕکاری، بووکی ساڵی جەژنان باوە خوون دەکرایەوە. پیرەمێردێکی بەو ساڵاچوو، لەگەڵ بووکەکەی هەر یەکە سواری گوێدرێژێك ببوون بۆ باوەخوون دەچوون، لە ڕێگا لەسەر کانییەك دادەبەزن، پشووێك بدەن، بووکە باری گران دەبی، بایەکی لێبەر دەبی، بووکە لەشەرمان هەر ئەوەتە بەسك(زگ) نادات، خەزوورەکەی زوو دەڵێت: کچم خوا باشی هێنا کوڕەکت دەبی، بووکە لە خۆشی کوڕی گەشایەوە، بووکە مامە یەکێکی تریش بکەم !
خەزوورەکە: جاری ئەو کوڕەی گەورە بکە.

## 53- جریو جریو.

کابرایەك کۆمەڵە ڕەشوێرەیەك دەگرێت، بە نییەتی چەقۆ هەموویان سەر هەڵدەکێشیت، دەچێتە لای مەلای دەڵێت حەرامە.

کابرا: مامۆستا جورکەکم بۆ ئێوە نارد.

مەلا: ها حەڵاڵە لام وابوو گۆتویانە وریو جریو.

## 54- جێ سمی کەرێیە، خەسرەتی ئەسمە رێیە.

دەگێڕنـەوە لەسـەردەمێکی زۆر زوو، پیرێـژنێکی کـارکردەی ئۆینبـاز، ژنێکـی بۆ کوڕە تاقانەکەی خواست.

پیرێژنـەی خەسـوو، دایکـی کـوڕە، مـاوەی بـووکێی نـەدەدا دەسـت بـۆ چ ببـات، نەمرو نەژین دەژیا، ماوەی بووکێی نەدەدا بە ئارەزووی خۆی تێر بخوات.

پیرێژن زۆر دڵی بەماڵەوە بوو، ڕۆژێك خەسوو دەچتە جێیـەك، ژوورەکە سـواق دەدات، تا دێتەوە دەرگای پێوە دەدات. بووکە دڵی دەچتە ناو سێری، سـواریێ کەرەکەیان دەبێت، دەچتە ژوورەکە چەند چەنگێك ئارد دەهێنێ.

پیرێــژن دێتــەوە ســەیر دەکــات، کــەر چــوویتە ژوورەوە، کەنــدوو ئــاردی لێدەرهاتووە دەڵێت: جێ سمێ کەرێیە، خەسرەتی ئەسمەرێیە.

## 55- چاوت بە چاوی زەرەری دەچوو!

کابرایـەکی لادێیـی چـەند مـەڕێك دەکڕێـت بـۆ فرۆشـتنەوەو قـازانج لێکـردن، ڕۆژێـك دەگەڕێتـەوە دەبینێـت، مـەڕە باشـەکەیان مـردار بوویتـەوە، لـەدەورەی دەسووڕێ، خەفەتی لێدەخوات، خۆی پێناگیرێت، لەقەیـەکی لێدەدات دەڵێت: چاوت بە چاوی زەرەرێ دەچوو!

* ئـەم پەنـدە کەسـێك دەیڵێـت، ئومێـدێکی زۆری بـە شـتێك بێـت کەچـی ئەنجامی بە پێچەوانە خراپ بێت.

## 56-چمان بەچاوی خۆ نەدیتیە، چی چاکیشمان گویێ لێنەبووە، پیاو شکی خۆی بەیەقینی خەڵکی نەدات.

دەڵێن سالێك ئەو دەشتی هەولێرە نەهاتن دەبێت، خاوەن وڵساتەکان ڕوو دەکەنە ئەو کێستانە، چەنداوێك دەمێننەوە لەگەڵ بەرە بابێکی ئەویێ ناکۆکیان لێپەیدا دەبیت. شەوێك لەنەدیوێکا زەلامێکیان لێدەکوژرێت، خەڵکەکە هەموو لەسەر گۆڕستان کۆدەبنەوە، چفتە چفت پەیدا دەبێت.

پیاوێکی سەر ڕاستی کوێستان بەویدا تێدەبەڕێت، بەخاوەن مردووەکان دەڵێت: چمان بە چاوی خۆ نەدیتیە، چی چاکیشمان گویێ لێنەبووە........ .

* ئەم پەندە بۆ سووربوون و ئاشکرابوونی کارێك بەکاردێت.

## 57-چوویتە ماریێ خاری.

کابرایەکی لادێیی کوڕێکی هەرزەکاری ملهوڕی دەبێت، باوکی گەلێك جار بەدایکی دەگۆت حورمیێ خۆت لادە، باتووشت نەبیێ.

پایز هات، بەخۆ کەوتن، ژنێکی نازداریان بۆ داخوازکرد، بۆیان گواستەوە، ڕۆژەك و دووان کوڕە شنگو وزەی لێبڕا، ئەوەندە بنساو بێعدووربوو، باوکە بیری کردەوە، ماوەیەکی لەماڵ دووربخاتەوە گوتی کوڕم: سیێ چوار ڕۆژان بە سەردان هەرو سەردانێکی ماڵی خاڵت بکە.

کوڕە ماوەیەك دوورکەوتەوە، گەڕاوە، هاتەوە سەرەخۆ، دیسان ملی لێکوشی زەبوون بووەوە، کوڕە، باوکە نەچمە ماڵی خاڵم؟

باوکە گوتی: ڕۆڵە ئاگاداری خۆت بە، ئەوەندە ماڵی خاڵت دەرنایینی.

دەڵێن هاوێنی بەرانێکیان هەبوو زۆر پەڕی بوو کوڕە گووت بووی باوکە: با بچتە ماڵی خاڵی.

### 58- چرای هەرکە، سووی تێماوە.

کابرایەکی دەشتەکی شکارتەیەك دەکات، دەڵێت، پیداوری گۆچان کەسك، هیمەتێکی لای خوا بکە لەگەڵم هاوبەش بە سالّ ڕوو دەکاتە هاتیّ، گەنم دەدروێتەوەو ڕەوسە دەکەوێتە گۆڕیّ ڕەوسە چ! ڕەوسە، تەماع گیر دەبێت و دەڵێت: پێداورە ئەتۆ شۆو وەردت لەگەڵ بڕیوم یارمەتی تۆ دانت داوم، دوورنەت لەگەڵ کردووم، ئاخر لۆ شەریك بی؟ بەخوا دنێکێکت نادەمیّ هێوارە گەوارەیەکی داهێنا، بروسك دەڤەرەکەی ڕووناك کردەوە، ڕەوسە بوو بە ئاومارك کە برووسکی دەدا، خاوەن مالّ، ڕەوسە، دەیگوت: هەڵکە، سووی تێماوە.

### 59- حەسەنم گەورە کرد بە کەڕولاری، حوسێنم گەورە کرد بە کەڕولاری، بە زمانت هێنام بەزەبری هەوێداری.

دەڵێن پێغەمبەر(د.خ) فاتیمەی کچی دەداتە ئیمام عەلی پێی دەڵێت کچم لە قسەی دەرنەچی، بێدلی مەکە، لەبەردەمی ڕاست مەبەوە، بەبەردەمی ڕامەچوو، ئەرکی ژنایەتی چییە کەمتەرخەمی لێمەکە.

فاتمە قسەی باوکی لە گوێگرت، واتە پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی باوکی کرد، ئیمام عەلی بەکەمدووی دەزانی.

ڕۆژێك ئیمام عەلی دەڵێت: پیرێژن ئەوا تۆ بەناو سالّ کەوتووی ئەرکی ژن و مێردایەتی بەتۆ جێبەجیّ ناکرێت، ئەگەر ماوەم بدەی دەمەویّ خۆم نویّ بکەمەوە.

فاتیمە دەڵێت: حەسەنم گەورە کرد بە کەڕولاری حوسێنم گەورە کرد بە کەڕولاری...... .

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن بەندکارکی زۆر درێژ بکات.

## 60- حەمەد عەیشیٚ، دەستی شکایە، ئاغەی چ بەرایە؟!

حەمەد عەیشیٚ، سەرکاری پاشای بوو، لەسەر دیواری بەردەبیتەوە دەستێکی دەشکیٚ، ئاغەی پاشای چاوی پێدەکەوێت لەخۆ دەچێت.

خدرۆکە جوو دەڵێت: حەمەد عەیشیٚ دەستی شکایە، ئاغەی.... .

بە بۆ چوونی من ئەگەر بەم شێوە بیٚ دەبیتە ئەدەبی میللی، بەڵام ئەم گۆتەیە لەم پەندە وەرگیراوە: زای زایە، ئەستەویری چ بەرایە؟!

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن لەخوتو خۆڕایی کارەساتێك پەیوەندی بەویوە نەبی خۆی پێوە پەستو دڵگیر بکات.

## 61-حەیران لە تەمتەمبەکونی، نە ئەمە کرمانجین و نە ئەتو مەزنی، تارماییەکی لەبەرچاوی دوژمنی.

دوو بەرە باوك لەو گوندە دەژیان، کوشتارێکی زۆریان لە یەکتر کرد، بەرە باوکێکیان سەرۆکەکانیان کوژرابوون یەکێکی ئاسییان کردە سەرۆك، ڕۆژێك لەگەڵ کۆمەڵە سوارێك بەلای پیرێژنێکی زیرەکی لەخۆیاندا تێپەڕین پیرێژنە گوتی: حەیران لە تەمتەمبە کونی........ .

* ئەم پەندە بە کەسێك دەگۆترێت کاروبارێکی درابێتە دەست لێی نەوەشێتەوە لە ناچاری بوو بێتی، یان ئەم شوێنەی گرتبێتەوە.

## 62- حەمەدە ڕووت سەر قەڵەمدارە.

سەردەمێك سوڵتانەکانی ئەستەنبۆڵ، سولەیمانی قانوونی و..، ڕوویان دابووە چاکەکردن، دانیشتوانی قەلەمڕەو ئاسوودە کردن، لەناو

دامودەسگا(دامودەزگا)کانی وڵات پیاوی بەتواناو لێهاتوو شوێنی پێی خۆیان کردەوەو نرخ و ڕیزیان لێندرا.
پاش ئەم یەکدوو سوڵتانە شازادەکان ڕوویان کردەوە خراپەو خراپەکاری پیاوی باش و تێگەیشتوو دەربەدەر کران لەشوێنی ئەوان پیاوی دوو ڕوو، تەڵەکەبازو پیسۆو بێکەڵك سەریان قوتکردەوە، ئەم کردارە ناڕەوایانە گشت ژێــر دەســـتەکان- موســـلمانەکان-ی گرتـــەوە لەوانـــە دامودەســـگاکانی کوردستانیشی گرتەوە.

لەم کوردستانە پیاوێك هەبوو، ناوی حەمەدە ڕووت بوو، بەڕاستی ناوەکەی خۆی لێدەوەشاوە، لەم لێشێوانەی سەلتەنەتی عوسمانی ئەویش یەکێك بوو لەوانەی توانی کەلك وەربگریٚ و خۆ بباتە پێش، بوو بە قەڵەمدار، دوایی بوو بەسەر قەڵەمدار دەسەلاتی گشت دەوروبەرەکەی گرتەوە، وای لێهات نۆکی بە نۆپاران نەدەخوارد، کەسی لەژوور خۆی نەدەزانی.

ڕۆژێك پیاوێکی گەورەو لێوەشاوە دەمرێت، هەموو دانیشتوانی شار چوو بوون لەوانە حەمەدە ڕووتیش بەشداری چوونە سەر گۆڕستانی کردبوو، حەمەدە ڕووت هەر چواری لای گیرابوو، کەسانێکی زۆر دەست لەسەر دەستان وەستابوون، هەر جارەی لای لە یەکێك دەکردەوە.

تەرمەکەیان خستە ناو بیرازەی گۆڕەکەوە، خۆڵیان بەسەردا کرد، مامۆستا تەلقینی دا، ئینجا دواجار فاتیحە خوێندرا.
مامۆستا داوای لە حەمەدە ڕووت کرد، بابگەڕێینەوە، حەمەدە ڕووت گووتی:
مامۆستا شتێك مابوو لەم مردووە بگەینیٚ بۆ لەم مردووەت نەگەیاند؟
مامۆستا : ئەوی شەرع بفەرمووی ٚ – بەگ – گشتم جێبەجیٚ کرد.
حەمەدە ڕووت: شتێك مابوو بیلێیت!
مامۆستا: بفەرموو – بەگ – چی بوو؟

حەمــەدە ڕووت: بــەم مــردووەت نــەگۆت، بــە مردووەکــانی پــێش خــۆی بڵــێ ئەوەندەیان چاو لە دنیایی نەبێ، حەمەدە ڕووت سەر قەلمدارە.

## 63.خەپەم تەڕە مەیتراشە، خزمان گۆتیان زۆر باشە.

کابرایــەکی ئــەم دەشــتی هــەولێرە دێتــە شــاری خەپــەکی جــۆتی دەکــڕی دەیباتــەوە گونــدی، ئێــوارە دەیباتــە دیوەخــانێ، نــاو خزمــان هــەموو دەڵــێن خەپەکی چاکە. بەیانی زوو خەپەی دەست دەداتێ لەگەڵ جۆتیارەکەی دەچێتە جــۆتی هــەر چــەند دەکــەن جــۆتو گــا ڕێــك ناکــەوێت، خەپەکــە ڕشــت بــوو. جۆتیارەکە دەیەوێت بیتراشی بەڵکو کەمێك مارتری بکات،
کابرا دەڵێت: خەپەم تەڕە مەیتراشە ..... .
* ئــەم پەنــدە بــە کەســێکی ســاویلکەی خــۆش بــاوەڕ بــە خزمــان و ناشــارەزا لەکارێك دەگۆترێت هەر لەسەر هەڵە بڕوات.

## 64- خەم لۆ مام خەمکی دەبی.

مــام خــەمك لــەناو کــورددا بــۆ پیــاوی خێرخــواز بــەکار هــاتووە، بەرژەوەنــدی گشتی دۆستو ناسیاوانی ڕەچاو دەکات، کەسێك لێی بقەومایە، ئەو لەماڵی خــۆی خــەمی بــۆ دەخــوارد، بۆیــە ناویــان لێنــا مــام خــەمك، ڕۆژێــك بێخــەم نــان دەخوات یەك دەڵێت: کەرێ فلانی زایە جاشکەکە کلکی نییە.
گۆتی ئەو نانەی لابەن ئەو نانــە تــازە چــۆن دەخورێت، ئــەوەبووە کــەر لــە قــوڕی عاسی بوو چۆن دەردێت؟

**65–خەنجەر لە قەدم، دەمانچە لەنێکم، خۆ مریشك نیمە بەندووك شەڕ بکەم!**

خەڵکی شاری بە ترسنۆك ناویان دەبرێت، ڕۆژێك لە گوندێکی ئەو دەشتی گەرمیانە کوڕە لاوێکی چەکداریان تووشی پیاوێکی دەشتەکی بێچەك دەبێت، کابرا خۆی لێسوور دەکاتەوە دەڵێت، بینە خەنجەرەکەت، دەڵێت ها، دەڵێت بینە دەمانچەکەت دەڵێت هانی.

ئێوارە دێتەوە دیوەخان خەڵك گەمەو گاڵتەی پێدەکەن، چۆن دەستت هەڵنەهێنا.

کابرای خەڵکی شار دەڵێت: خەنجەر لەقەدم، دەمانچە لەنێکم خۆ....... .

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن بێدەسەڵات بێت، پەکی لەسەر هیچ نەکەوێت. کەچی نەتوانێت دەست هەڵبینێت.

**66– ا – خواردن بەشی زندیان ناکا، نۆبەتی مردیانە.**

**ب– لە مڕەمڕەی بەرازی ناترسی، لە قورە قورەی جەڕەی دەترسی –کودی–**

خوشکێك‌و برایەك بەیەکەوە دەژیان، کچە خۆی زۆر قەلە زراو کردبوو، دەیگۆت: لە قورە قورەی جەڕەی دەترسێم، برایەکەی بێزار کرد بوو، تا گەیشتە ئەندازیەەك دڵی لێ پیسکرد، ویستی ئەزموونی بکات. ئێوارەیەك بە خوشکەکەی گوت میری بڕیاری داوە، هەر کەسێ هەتا بەیانی مەنجەلە

ساوارێکی لە گۆڕستانی بکولێنی، ئەوی بیەوێت میری دەیداتە وی. کچە چوو مەنجەڵێکی هەڵگرت، چووە وێندەر، لێك لێکە ئاگری دەکرد، براکەی پاش نیوەشەو بەرگێکی سپی لەبەر کرد، لەسەر لەپان لەنێوان کێلەکان بە مرە مڕ بۆلای خوشکەکەی چوو، کچە بێئەوەی ئاوڕی لێبداتەوە، شیشەیەکی لێدا، گوتی خواردن بەشی زندیان ناکات، نۆبەتی مردیانە.

* ئەم پەندە بۆ کەسێك بەکار دێت، بۆ مەبەستی خۆی، خۆی نەزان بکات، کاتی پێویستیش بۆ مەبەستی خۆی باکی بە چ نەبێت.

## 67– خۆ دەرێن شینکە، پیاوی برایماغەیە.

ئەم ڕۆژگارە خەڕەکەکەی هەردەمە برەو بەشتێك دەدات، هەر سەردەمەش پیاوی خۆی هەیە.

شینکە ناوێك هەبوو، پیاوی برایماغەی بوو، شەو ڕۆژ برایماغە نانە سك دەیڕەتاند بەرهەمەکەی بۆ ئاغا بوو.

یەکێك لێی دەپرسی ئەریّ کاکەی برا تۆ ئەو هەموو حەوکەت لە چییە، ماندوو مردوو ڕەنج بابردوو.

شینکە: باوکم من هەرچی بکەم وەیا نەکەم کەلك وەربگرم یاوەرنەگرم ئەوەندەم بەسە کە خەڵك دەڵێن: شینکە پیاوی برایماغەیە.

* ئەم پەندە بە کەسێکی سادەو ساویلکە دەڵێن بەستایش بەهیچە کار بۆ یەکێکی تر بکات بەرژەوەندی خۆی پیّ شێل بکات.

## 68–خیتیّ مێردان، خیتیّ ژنان، تفەك‌و شەقەك.

ئەم گۆتەیە لەناو زاروکانی گوندان باوە، سالأنە ئەو مندالأنەی لەنویّ وەگەل ڕەویّ دەکەون، نەشارەزای داب‌و نەریتەکەن، دووبارە دەکرێتەوە.

شوان، یا بەرخەوانە شارەزا گەورەکان، بۆ بەزم نانەوە بە منداڵە نەشارەزاکان، دوو منداڵی کەودەنی دەهێنن، ئەوانەی تازە بەشداری بەرمەڕی یان... دەکەن، بەرامبەر یەك تر ڕایان دەگرن، بۆیان دەخوێنن بەشەڕیان بهێنن، یەکێك لەگەورەکان خیتێك دەکێشێت، دەڵێت ئەوە خیتیّ مێردان، خیتێکی تری داردەولکانی لێدەدات دەڵێت ئەوەش خیتیّ ژنان، تفێك و شەقێك.

ئەو دوو منداڵە بەچەپە ڕۆکان وەردەگەڕێنە یەکتر، تێروپڕلێك دەدەن، ئەوانیش تێر پێیان پێدەکەنن، ئینجا لێکیان دەکەنەوە، دەڵێن ئەوە گەمانە گەمان، هەر ئەو دەم چاکیان دەکەنەوە، دەست دەکەن بەیاری کردن.

* واتای ئەم پەندە، ئەم بەزم نانەوەی شوانی کوردە، ئەمڕۆ لەجیهانی ئەمڕۆدا باوی ساندووە، زڵهێزەکان وازی بە بێهێزەکان بکەن.

## 69- دایك لاربی ، یا مانۆکیّ ماخدرە مرن؟

پیرێژنێك کچێکی جوانی دەبیّ زۆری خۆش دەویّ، پیرێژن دەیوت من کچی خۆم دەدەمە خدر ناوێك بەناو خدری زندە کرابیّ، نەمریّ، ڕۆژێك خدر ناوێك دەنێرتە داخوازی پیرێژن کچە دەداتە خدر ناوەکە. مانێگو دووان، لەناکاوێك کتوپڕ خدر دەمرێت، هاوار بۆ پیرێژن دایکی ژنە دەنێرن پیرێژن دەگاتە ناوشینیّ بە لەخۆدان دەڵێت: یا مانۆکی دایك لاربی ماخدرە مرن؟

* ئەم پەندەش بەکەسێکی ساویلکە دەڵێن بۆ چوونێکی هەلەی هەبیّ.

### 70– دەبا دەربەندۆك وەت لێبێ، جووت بە بارە کووتارەوە پێدابێ.

جیهانی ئەم سەردەمەی ئێمە زۆر بە گۆڕ بەرەوپێشەوە دەچێت، هەست و هۆشی مرۆڤ لە گۆڕان و پێشکەوتن و برەو دایە، هەر ڕۆژە بایەخ بە شتێك دەدات لە ئاکامدا خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی و ...ی مرۆڤی تێدا سەردەمێك لەم وڵاتەدا باو باوی دزی و جەردەیی و ڕێگری زۆر لێکردن بوو، دەربەدنی گۆمەسپانی یەکێك بوو لەم شوێنانەی کەم کەس هەبوو بتوانێ بە نوێژی نێوەڕوانێ پێیدا بڕوات، زۆر کارەساتی گەورە گەورەی لێڕوو دەدات. بەم دواییە، ماوەیەك فەرمانڕەوایان دەسەڵاتیان بەسەر ئەم جۆرەکارانەدا گرت، نەوەك ئەنجامی بە زیانی وان بگەڕێتەوە. ڕۆژێك کابرایەکی پیری کەنەفتی بە ساڵاچووی پشت کۆماوە، گۆچانێکی دابووە بەرە خۆی وارە وارە، بە دەربەندۆکدا دەڕۆیی یادگارەکانی پێشووی سەردەمی لاویەتی دەهاتەوە بەرچاو، ژن منداڵیان پێ ژێر دەکردەوە، چاوی پێکەوت جووێك بەبارە کوتارەوە بێخۆکاو پێدا دەڕوات، وتی: دەبا دەربەندۆك وەت لێبێ، جوو بە بارە....... .

### 71–دەبانی .

جۆتیارێك سەر سەدەی بۆ ڕاکێشا بوو، بەهارە جۆتی دەکرد، کەرکەکی ڕەشی نوێی هەبوو لەسەر سەدەی دانابوو، ئاگای لە عەبدی بێزەوار نەبوو .
دزێك، سەر دەستەی دزان بەوێدا تێدەپەرێت، گەوارەیەکی دەهێنێت، دزە کەرکی نوێی جۆتیار لەبەر دەکات، کەونە کەرکی خۆی لە شوێن دادەنێت، دەچێت لە زەونـدۆرێك سەیری جۆتیار دەکات، باران خۆشی دەکات جۆتیارەکە غارەداتە کەرکی هەڵگیرو وەرگیری دەکات کەس دیار نابێ، تێی هەڵدەدات.

دزەکە لە بەرەخۆی: دەبانی. بارانی سەربەکلاوە دادەڕێژی ناچار دەچێت قۆڵی تیٚ هەڵدەکێشتێت.

ئەم پەندە بۆ کەسێك دەگۆترێت شتێکی بەتۆبزی تووش بکرێت و بە ناچاری ملی بۆ کەچ دەکات و بکرێت بەهی ئەو لەجیاتی شتێکی لەباری تر تووشی ئەم نالەباریە بکرێت .

## 72. أ. دەچمە مارەکی، کەس لە خۆم گەورەتر نەبی .

## ب . دەچمە مارەکی، خۆم میر کوڕبم .

لە سەردەمێکی زۆر زوو کابرایەکی کار بە دەست دەبێتە میوانی گوندێکی ئەم کوردەوارییە، لە دیوەخانەکە میوانی زۆر لێدەبن، بەسەر ماڵانیاندا دابەش دەکەن، کابرای میوان دەڵێت: بمبەنە مارێکی کەس لە........، دەیبەنە ماڵێکی بێسەردار یەکدوو منداڵیان دەبێت. ئێواری لەنگەریەکی سەر بە مریشکی خۆشی بۆ دروست دەکەن لەپێشی دادەنێن، منداڵەکان پڕەدەنە گۆشتی سەرپلاوەکە کابرا دەڵێت نەمگۆت: دەچمە مارێك کەس لە خۆم......

* ئەم پەندە کەسێك دەوترێت لەملا و لەولا نەیەوێت کەس دەست بۆ بەرژەوەندی درێژ بکات .

## 73–دەردی سەی ڕەشی گەیشتی، درایی ٚ.

لەو سەروە لە مەزنە دێیەك سەگێکی ڕەشی هەبوو، سەگ چ سەگ دەتگۆت هرسە، گوندەکەی ناخۆش کردبووو، ئەو جێی ئەو لێبووایە کەس نەدەوێرا بەوێدا تێبپەرێت، سەگ و گوجیلە و توولە، هەر ڕۆژە یەکێکیانی یانیوە گیان دەکرد، یا دەیخنکاند .

ڕۆژێك گێچەری بە توولەیەك کرد زۆری لێکرد، توولەکە لە خۆی بێزار بوو بەحەپە حەپ پڕی دایی ٚ، سەگە ڕەش کشاوە کەوتە ناو چاڵێکی بەتاڵ، هەر

چەندی کردی پێی نەکرابێتە دەرەوە، منداڵی گوندی کۆری خۆیان پێدەربڕی، بەردە بارانیان کرد، هەتا نووزەی لێوەهات بە بەرد و کەستەك لێیاندا.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن بە هێز و توانای خۆی لەخۆبایی نەبێ دوور نییە لە خۆی گچکەتر کارێکیان لە دەست بێت لە دەستەوی نێت.

## 74- ا. دەرێم دەرێم، لاق باریك.

## ب. دەرێم دەرێم، وەزت مری.

دەڵێین لە ئاواییەك، ژنێك هەبوو، سەرگێڕی دەکرد، کوڕێکی هەبوو، ژنە وای بۆ چوو بوو، کوڕەکەی بە نهێنی کارە نا ڕەواکەی دەزانیت، هەرچی داوا بکردایا بۆی جێبەجێ دەکرد، دایکەی زۆر بێزار کردبوو، دایکە ئەگەر خۆی گران بکردایە کوڕە فێرببوو دەیگۆت دەرێم، ژنە لەترسان تۆقی بوو، ڕۆژێك ژنە مێردەکەی لە ماڵ نەبوو، گوتی با تاقی بکەمەوە، بزانم چیی دەڵێت کوڕە دەڵێت دەڵێم دەڵێم، ژنە چەپەلۆکێکی لێدەدات دەڵێت دەبڕێ، بلی کوڕە بە تووڕەییەوە، أ. لاق باریك، ب. وەزت مری.

ژنە لە خۆشیان شاگەشەکە دەبیت چەپەلۆکێکی تری لێدەدات دەڵێت، یا خوا لەوەتی پار دەمردی.

## 75- دەرێی گێرەی ئۆمەرە خێلی قووچیە!

ئەمە بەم دەربڕینە بەر ئەدەبی میللی دەکەوێت، بەڵام لە زۆر شوێن باوە، لە ئەدەبی میللی دەردەچێت، دەچێتە ژێر سێبەری ئەدەبی فۆلکلۆری.

دەڵێن کوێخوا ئومەرە خێلی قووچی کەندیناوە زۆر دەوڵەمەند بوو، هاوینان تا ئێوارە بە ئێستارن شەغرەیان دەکێشا بێئەوەی شەغرەکان پەرد بکرێن تا ئێوارە. ئێوارە گێرەی دادەبەستا ئەو ولاغە بەستەزمانە لە ئارەقەی ڕەش و شین هەڵدەگەڕان، هەتا بن پێلان دەکەوتنە ناو قرشەی، ئەم کارە لەبەر کەم

ماندووبوونی دەکرا، کارێکی زۆر نابەجێ و لاپرە سەنگە، ئەوانەی لەم کارە شارەزابن دەزانن چەند نارێکە! خەڵکەکە ئەمەیان کردووە بە پەند.
* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن کارێکی لاترە قەوچی بە تۆبزی بکات.

## 76– دەرێی مریشکی خەرابەدراویە .

دەڵێن لە گوندی خەرابەدراوی دەردە مریشك هات، یەك پیرە مریشك و یەك دوو کەڵەشێر ڕزگاریان بوو بوو، کەڵەشێرەکان دەهاتن و دەچوون، غاریان دەدا پیرە مریشکی و بەسەری دادەفسین، هەتا پیرە مریشکیان ڕووتاندەوە، کورکی پێوە نەما، لە پەلوپۆیان خست.
ئەم پەندە بە کۆمەڵە کەسێك دەڵێن یەکێك بتەقێننەوە، ئەویش بەری ئەم تەقلەیە نەگرێت، تێك بچێت .

## 77– دروونەی حەفت دەرهەمباویش دەزانین .

ساڵێك ئەم دەشتی هەولێرە نەهاتی بوو، خەڵك بەملاو بەولادا پەرت بوون، چەند کەسێکی کەندێناوە بۆ سەپانی و کرێپاڵەیی چوو بوونە ناو دیانەکانی عەنکاوە، ڕۆژێك دیانێکی قرچۆك دەڵێت: من لە حەفت دەرهەم ڕۆژانەی کرێپاڵە پتر نادەم.
پاڵەکان دەرێن ناچین، یەکێکیان زیرەك دەبێ دەڵێ: دروونەی حەفت دەرهەمباویش دەزانین .
* ئەم پەندە و گۆتەیە کەسێك دەیڵێت، بەپێی نرخی کرێیەکەی کار بکات .

## 78– درۆ هەر قابیلی پیاوی گەورەیە.

ڕۆژێك لە كۆڕێكی جوامێر و پیاو ماقوولان قسە قسە دەكێشێت، قسە هاتە سەر درۆ كردن، كێ درۆی دەكات؟ بۆ چ درۆ دەكرێت؟

دەمڕاستی كۆڕەكە گوتی: . درۆ هەر قابیلی پیاوی گەورەیە.

هەندێك لێی ڕاست بوونەوە، چۆن وا دەلێیت؟

دەمڕاست گوتی: پیاوی هەژار كەس بە ڕاستی باوڕ ناكات، نۆبەتی درۆیە، پیاوی گەورە، دەوڵەمەن، بۆی پنج دەكرێت.

## 79- ا. دنیا لۆیی خۆشە، بێدەركەیە.

## ب. تڕا خۆم سوڕاخۆم، لەبن كەچە بەڕاخۆم.

سولیمان پێغەمبەر سەیری كرد، هەموو گیانلەبەرەكان، باڵندە، دڕەندە، ئاژەڵ، خشۆك... سەردانی دیوەخانیان دەكرد، ژووشك نەبی، دوو پیاوی بەدوادا نارد، چوون هێنایان.

سولەیمان پێغەمبەر لێی پرسی: ئەوتو لە كوێ بووی؟ بۆ دیارنی؟

گوتی: دنیا لۆێی خۆشە، بێدەركەیە.

سولێمان ماویەك لای خۆی هێشتیەوە، ژیشك هەر دەیگوت ماوەم بدە بچمەوە ماڵی خۆم، بەری هەڵدا، دوو باوڕ پێكراوی بەدوادا نارد، چووە ناو لێڕەكی چڕوپڕ یەك بەخۆ ڕاكێشا گوتی: تڕا خۆم سوڕاخۆم، لەبن كەچە بەڕاخۆم.

* واتای ئەم پەندە ئەوە ئازادی و سەرفرازی ژیان دەگەیێنێت.

## 80- دواسێ، هەر ئاگرەكی لێدا بگیرسێ.

دەڵێن شێخی باڵەكان بەرەو ڕواندوز و هەولێر دێتە خوارێ، لەم دواسێیە، میوان دەبێت، پشووێك بدات، خانەخوێیەكە میواندارییەكی باشی ناكات، باشی وەرناگرتەوە، لە ڕۆیشتندا دەڵێت، دواسێ هەر ئاگرەكی..... .

هەندیکی تر دەڵێن: تا پێشتر ئەو قسە هەبووە، دراوەتە پاڵ شێخی باڵەکان، ئەمەش نزیکە، چونکە شوێنەکەی دەوروبەری شاران، ئەوەندە بایەخ بە میوانداری نادەن.

### 81- أ. سەری لەبن بەڕێ، قوون دەکا شەو لەوەڕێ.
### ب. دۆینەی بە زڕە پوونگێیە.

پیاوێکی کۆچەری ڕەشماڵنشین، ژنەکەی کۆنە دۆستێکی هەبوو، شەوێ لە کاتی دیاریکراویدا پاشەری بۆ دۆستەکەی لەبن چیغی ڕەشماڵی دەبردە دەرێ، سەریشی لای هاوسەرینەکەی، مێردەکەی بوو، دەئاخاوت، دەیگۆت: ئەوە چییە؟ سەر لەبن بەڕێ قون دەکا شەو لەوەڕێ ؟

مێردەکە دەیگوت: دۆینەی بەزەڕە پوونگێیە.

* ئەم پەندە بە یەکێکی فێلباز دەگوترێت، یەکێکی تر بەهەڵە ببات.

قسەی مێردەش: بە کەسێکی ساوێلکە دەگۆترێت، هڕی لە بڕی نەکاتەوە.

### 82- دێرێ چاوم هەر لێتە.

دیانێك موسلمان دەبێت چەنداوێکی پێدەچێت، ڕۆژێك بەڕێککەوت ڕێی دەکەوێتە لای دێرێ، ئارەزوو یادگاری سەردەمی منداڵی کڵپە دەکات، خۆی پێناگیرێت، دەڵێت: دێرێ چاوم هەر لێتە.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن وازی لە شتێك هێنابێت، چاویشی لە دوای بەر نەدات.

### 83- ژن هەیەو ژنۆکەش هەیە.

سوڵتان مەحموود و حەسەن مەمەندی خوندکاری، شەوان ناوە کردبوویان بە خوو جلكو بەرگی خۆیان دەگۆڕی، شمەکی سادەیان لەبەر دەکرد، بەنهێنی لەناو کۆلانی شاری خەزنە دەگەڕان بێئەوەی کەس هەستیان پێبکات تا بەچاوی خۆیان ڕاستو چۆنیەتی چاکەو خراپەی گەلەکەیان ببینن.
شەوێکی بڕکۆکەك سارد، هەموو کەس لەدەرەوە خۆی ڕاناگرت، لەم شەقام بۆ ئەو کۆڵان لە پەرساگەیەکی گەڕەکێکی ئاسایی ناو شاردا، وەك شێرێکی برسی نێچیرێکی تەڕو قەلەو خۆیان مەلاس دابوو.

ئەستێرەکان ماندووی چاو شارکێی یەکتری بوون، هەندێکیان خەریکی ماڵاوایی یەکدی بوون، هەندێکی تریان تازە سەر لەنوێ ڕەونەقیان دەدا، پیرو تەرازوو ئاوابوون، دنیایەکی کشومات، خەڵکی هەموو لە شیرینە خودابوون، منداڵە ساوا شیرە خۆرە، جار جارە نووزەیەکیان لێوە دەهات دایك لەم سێباری نیوە شەوەدا، ژنێك لەبەرانبەریانەوە، جیجکە جۆرەی دەکرد، دەرگای قەمتەرەی دەکردەوە دەچوو ژووریٚ، چەنداوێکی پێدەچوو دیسان دەهاتەوە، سەیرێکی ئەملاو ئەولای کۆڵانێی دەکرد، تێر ڕادەما خۆی نەوی‌و بڵند دەکرد.
سولتان و حەسەن مەمەندی بەگوێی یەکیان چرپاند، ئەم ماستە موویێکی تێدایە لێی گەڕێین نێچیری ئەمجارەمان نەخشەی کارەساتێکی ترسناك دەکێشێت، هەستیان لەخۆ بڕی.
ژنە بەدەم چاوەنواڕی ژوان و بەڵێنی خۆیەوە زوو زوو سەری دەردەهێنا تا لەکاتی دیاریکراودا پێی چەقاند، دوایی بەپیر کەسێکەوە چوو!.

سوڵتان و حەسەن زەق زەق تەماشایان دەکەن، ئەوانیش هەر هات لە ڕۆخ جۆگەکەی ناو شار بەرانبەری یەکتر بوون.

کابرا هەروەستەیەکی کرد، ژنە بە پەلە داخوازی پەڕینەوەی لێکرد، سەر زەنشتی دواکەوتنی لێکرد، با مەم و زین ئاسایی با کەمێك تا مەزرۆ بڕی خۆشەویستیمان بشکێنین.

پیاوە کە زۆر بەهەستو زیرەك بوو لە ملاو لەولای خۆی ڕاما هیچی بەرچاو نەکەوت، دنیایەکی بێدەنگ و هەست، تەقە ڕەقە لە هیچ لایەك نەدەهات، هەستی شەشەم ئاگاداری کابرای کردبوو، ئەنجامی ئەم بەیەك گەیشتنە بڤەیە، بیانۆی دەدۆزییەوە، دوا پەلپی ئەوەبوو ناوێرم بپەڕمەوە، مەگەری سەری مێردەتم بۆ بهێنی لەناو جۆگەکە دابنێی ببێتە، بەردەباز، بەسەری دا بپەڕمەوە! ژنەی ئاگرگرتوو: ئای لەخۆشەویستی خۆت نەکەوی، وەك پاساری گەڕایەوە ماڵی، پاش چەند قومێك لەجگارە بدەیت، سەلك لەپاشۆل گەڕایەوە سەری مێردەکەی خستە ناو جۆگەکەوە دووبارە داوای پەڕینەوەی لێکرد.

دۆستەش دۆشداماوی ئەم کارەساتە ترسناکەیەبوو، لەبەرخۆیەوە بەمنگەمنگ: ئەمڕۆ پیاوەکەت بۆ شەوێك ڕابواردنی من وەك کارەمێژکە سەر بڕی، منیش دەکەیە قوربانی یەکێکیتر، ژنە لەژوانی بەجێهێشت، هەیپای لێکرد، دوو پێ هەبوو، دوو تریشی قەرد کرد.

فەرمانڕوا سولتان مەحمود لەلاتەریکەوە بەخۆ بە باوڕپێکراوەکەیەوە نقەی لەخۆ بڕی بوو، ئەم هەموو ڕوداوانەش بەچاوی خۆی دیتووە، وەك کوورەی ئاگر دەسووتێت، تانو پۆی بیرکردنەوەی لەبەریەك ترازا، دەست بەجێ فەرمانی دا ماڵەکە مۆر بکرێت، باوڕپێکراو دەمودەست جێبەجێ کرد.

ژنە ئەمشەوە خەو نەچووە چاوی، پێش تاریكو ڕوونی بەیانیان چووە دەرەوە، سەیری کرد دەرگای ماڵیان نیشانکراوە، زانی کار لەکارترزاوە، پیلانە گلاوییەکەی ئاشکرابووە، سزای تاوانباری وەردەگرێتەوە، ئەمبەرو ئەوبەری ڕاستو چەپ هەمووی مۆرکرد سولتان ئەمشەوە تا بەیانی هەر

حەسحەسی گێڕا، لەگەڵ سپیدەی بەیانی لەدوای تاوانباری نارد، ناردراو سەریری کرد گەرەك سەرانسەر بەهەمان ڕەنگ مۆرکراوە، ڕاسپێر گەڕایەوە، چی دیت بوو بۆ سوڵتانی گێڕایەوە، سوڵتان بە یەکجاری توند بوو، بڕیاری دا سێ شەوو سێ ڕۆژی دی بۆ ڕاوشکار دەڕوات تا دێتەوە نابێت یەك ژنی ئەمشارە بمێنێت، گشتی سەر بڕابێت. سولتان بە پەستی چۆڵو هەردەی گرتە بەر، حەسەنیش بە پەشۆکاوییەوە بەرەو ماڵ خەمو پەژارە دایگرت.

مەمەندی باوکی حەسەن پیرەمێردێکی دنیا دیتەی، مەردی مەیدانی سەردەمی خۆی بوو، مەرگ باوەشی بۆ کردبووەوە، مەڵبەدێکیان بۆ کردبوو، لە سەرینگانی دیوەخانیان دانابوو.

مەمەندی : کوڕیەم ئەمڕۆ بۆ ئەوەند ژاکاوی.

حەسەن: باوکەگیان غەمگینی هەر بۆ من باشە.

مەمەندی: ڕۆڵە چیت بەسەر هاتووە، بیگێڕەوە، بەلکو باوکت توانی چارەی بکات.

حەسەن چیان دیتبوو، هووردو باریکان بۆ باوکی پەککەوتەی گێڕایەوە.

مەمەندی : باشە سوڵتان فەرمانی لەسەر بوو؟

حەسەن: باوکەگیان، سوڵتان گوتی، پاش سێ ڕۆژی تر جێبەجێ نەکرابیت تۆ لەسێدارە دەدەم.

کوڕم واز لەم بیرۆکە بهێنە، ئەمە کارێکی وا سانا نییە، بەهیچ جۆرێك ناکرێت، خەمیش مەخۆ خوا چارەی تۆو ئەم خەڵکە بێتاوانە بکات چارەتان دەکەم، هەر ئەوەندە کە لە ڕاوگەڕایەوە، قەفەزو بالینگانی من هەڵگرە بیبە بارەگای سوڵتان بڵێ باوکم نەیهێشت منیش بەکوشتنی خۆم هاتمە بەرێ نەم توانی دڵی بشکێنم.

حەسەن ئەم سێ شەوو سێ ڕۆژە لەجاران چێتر لۆلکەو پیرخەنی بۆ باوکە مەمەندی دروستدەکرد، پاشا کاتی دیاریکراو گەڕایەوە بۆ شار، سەیری کرد، شار تێکدەقژقژا، ژن لەپیاوان زۆرترن بەیەکجاری گریساند لەدڵی خۆیەوە باری ئاڵۆزاوی لەمەڕ حەسەن دەزانی، بەرگی ڕەشی ماتەمینی پۆشی، ڕاسپیریکی نارده لای.

حەسەن، مەمەندی بەخۆ بەمەڵبەندەوە هەڵگرت بەرەو بارەگای وارە وارە هەنگاوی هەڵینا خەڵکیش ئەمبەرو ئەوبەری جادەو کۆڵانەکانیان گرتبوو، فرمێسک بەچاویاندا دەهاتە خوارەوە. پەرستگاکانی پڕی خوا پەرستابوو بوون نزاو پاڕانەوە لەهەموو لایەکەوە دەچوو کەشکەلان ئاسمانی، هێزی چاکە بۆ کەنگینتە!

مەمەندی لەناو مەڵبەندەکەوە ڕیشی سپی گەیشتۆتەوە سەرچۆکی قولابی لەبرۆیەکان دابوو چاوەکانی بە ئاستەم دەتروسکانەوە، ئەملاوئەولاش داری هەڵباوێی بەزەوی ناکەوت تا حەسەن گەیشتە دیوەخان، سێدارە لەبەرزاییەکەی بەر بارەگای ئامادەکرا، حەسەن بەڕێزو نوازشەوە چووە پێش سولتان و سەلاوی لێکردو قەفەزی لەبەردەم دانا.

سولتان بێئەوەی سەیری حەسەن و قەفەزی دەستی بکات: کوڕە هەیناپاك، ئەوە بۆ فەرمانت شکاندووم؟

حەسەن بەدەنگێکی پچڕ پچڕ گفتوگۆی نێوان خۆی و باوکی بۆ پادشا گێڕایەوە.

سولتان ئاوڕێکی لەقەفەزەکەی مەمەندی داوە، لێی چووە پێشەوە: مامە مەمەندی پیری کەنەفتی بەسالا چوو، دەرچووی ئەزموونەکانی ڕۆژگار، کەی لەکاتی خۆی فەرمانی باپیرەی مەت شکاندووە، تا ئەمڕۆ حەسەن وا لێبکەی سەرپێچی فەرمانی من بکات، ئەمە لەتۆ ناوەشایەوە، خۆ هەر ئێستا ملی

تاقانەکەت بەسێدارە دەبینیت، تا ببێتە پەند بۆ ئەوانەی سەرپێچی فەرمانی من دەکەن.

مەمەندی هاتە زمان: مەحموودە، کوڕپەم ئەوانەی تۆ دەیلێیت هەموو ڕاستو دروستن، من بێبەلگە لەخۆڕایی بێبیرکردنەوە، حەسەنم قەدەغە نەکردووە، ئەوەشم هەر بۆ خێرو خۆشی قەلەمڕەوی ئێوە کردووە، ئەوا من ئازایەتی و مەردایەتی ژنێکت بۆ دەگێڕمەوە پاشان فەرمانت لەسەر چی بوو سەرفیراز بە، بە ئارەزووی خۆت بکە، تکات لێدەکەم ماف ئەو خزمەتەی بۆ بنەماڵەکەی ئێوەمان کردووە، گویم بۆ شل بکە.

لەم شاری غەزنەیەی کەتۆ دەیبینی، ئەنگوستیلەیەکە بەدەستتەوە، دەنگوباسێکی لێبلاوبووەوە، هەر شەوە لاوێکی لێدەکوژرا، شەوێك نەبوو، دوو نەبوو، مانگێ نەبوو.... تا ڕێز گەیشتە نزیك کۆلانی ئێمە، مەمەندیش ئەم مەمەندییەی ئێستا نەبوو لە بێشکەدا منداڵیان پێ ژێر دەکردمەوە، هەر کەلێنێکی گەورە بەمن نەکرابووایە، نەدەکرا، هەر لەشکرێك باوکی حەسەنی تێدابووایە شکانی بۆ نەبوو، دوژمن خۆی لەبەر ڕاناگرت، لەم کوشتن کوشتنە ترس گرتمی خۆم بەخۆمم گوت، هەی لەمنت نەکەوی، کوڕی بۆرە، ئەوە بۆ ملاکە خوێنێك دەپارێیەوە، مادام تا ئێستا هیچ هێزو دەسگایەك نەیتوانیوە سنور یا بەردەستی ئەو هێزە زاڵە بکات، یا مردن یان زاڵ بوو، یان مەمەندی یان هێزی زاڵ بەر دەستکردنی.

ئێوارە چەکم گرتە دەست، جوانە ماینی خاڵخاڵم زین کرد، لەنیوەی شەودا، لە پڕ دەنگێك لەدەرەوە بانگی کرد، مەمەندی لە ماڵێی؟!

گوتم هات، یەك ڕکێب غارم دا سواری پشتی جوانە ماینی بووم، ها لەوێ، ها لەوێ هیچم نەدیت، گەڕامەوە، هەتا بەیانی دانیشتم، هەستوخوست نەبوو، بەیانی منداڵ بۆ گژوگۆڕێ ماڵێ هەستان منیش چووم نووستم.

شـەوی دووەم ئـەمجارە خـۆم ئامـادە کـرد چـوومە تەنیـشت جوانـە مـاینی خاڵخـالی کوتمـە هوڕینـان لـەکاتی شـەوی پێشتر دواتـر، چاوەنواڕی دەنگـی گۆڕینم دەکردەوە، دیسان دەنگی گۆڕین بانگی کرد مەمەندی لەماڵێی؟

نەپڕژامیٚ وەڵامی بدەمەوە، بەپەلە ئاوای سەرپشتی جوانە ماینی بووم، بڕۆ بـڕۆ تارماییـەك بزردەبوو بـەدیار دەکەوتـەوە، تا بەتـەواوی لـێم بزربوو، ناچار گەڕامەوە سپیدەی کازیوە چوومەوە ناونوێنو بالینگانی خۆم لێی نووستم.

شەوی سێیەم ڕووم کردە وڵاغەکەم وەك هووردە هوڕێنـەی سـەرە مـەرگ بکـەم، جوانــە مــاینیٚ خاڵخــاڵی پــەلت وەك باڵنــدە باڵنــەگرێت ئەمــشەو کارمــان لەکارترازاوە، شەوی سێیەم بۆکاتی هاتن شەو لەسێباری نیوە شەوی پێیەکم خستە سەرخانەی زینی، ڕمم خستە سەردەستان چوون بەرەو پیری مەرگەوە ئامـادە، چـاوەڕوانی کـاتو سـاتم دەکـرد، هـەمان دەنـگ زرنگایـەوە مەمەنـد لەماڵێی؟!

نەڕاند نەڕۆی هاتم، یا من، یان تـۆ، نـەمن نەئـەو پێـی وڵاغـەکانمان نـەدەیترا، هەر ئەوەتە لێمدیاربوو، وامدەزانی وڵاغەکەم چەقیووە، لەبەرە خۆمەوە مەمەند دیـارە ئـەمجارە مردنـە، جوانـە مـاینی خاڵخـاڵی کـەی ئـەوە زیـنی تۆیـە، تـرس پەلوپۆی هەردووکمانی بەستووە، سوار لـە دەسـتەتوو رزگـاری ببی! بڕۆ بڕۆ، چــەند هــەردەو کێوێکمــان بــڕی تارماییــە بزردەبــیو بەدەردەکەویتــەوە، تــا گەیشتنە شوێنێك دابـەزیو مـاینی بەجێهێشت ڕۆیـی، منـیش بەرزەکـەی خـۆم پێبەسـت کـرد، کەوتمـە دوای هـا لـەویٚ هالـەویٚ دوورو نزیـك لـە ئەشـکەوتێك چـووە خـواریٚ بـڕۆ بـەدوای ئـەو، نـەك مەمەندییەکـەی شـاری خەزنـەی، تـاوام لێهات، ڕمو چەكو پـشدێنو...م یـەك هـەموو بەجێهێشت، تـەنیا خەنجەرەکـەم، خەنجـەرە دەبانەکـەم بەدەمــەوە گـرت، بـڕۆ بـڕۆ بـەناو ئەشـکەوتی سـەخت،

لەکاتێکدا دەنگێك بەئاسپایی بەکنم داهات گوتی: مەمەندی هاتی؟ گوتی؟ بگەڕێوە بەمەبەست گەیشتن!

منیش بەلاکەلاك سەرم دەڕوا، لاقم ناڕوا، تا گەیشتمەوە دەرکی ئەشکەوت، کەمن چووم، ئەو دانیشت بوو، چەك‌و جلك‌و شمەکەکانی من هەمووی هێنابووەوە، لەتەنیشت خۆی دانابوو، کۆمەڵە دەمو لچێکی بڕاویشی لە پێشە خۆی دانابوو لەهی دەعبای نەدیتراو دەچوون، دەعبای دڕندە، تەمای دەست هەڵهێنان بەرامبەر بەم قارەمانە نیقاپپۆشە زۆر کزبوو، قسەی خۆم هەر دەکەم، چاوم قایم بەس لەناو دەروونەوە هیچ، جامە ئاوێکی دامێ، خواردمەوە، ئۆخەی ئەمجارەش نەخنکام لەتینووەتیان، هۆشم هاتەوە بەرخۆ ئەم سوارە ڕەشپۆشە دەبی لەڕەگەزی مرۆڤ بێت، کەزانی دەتوانم بڕۆم گوتی بابچینەوە لای بەرزەکانمان، ئەو پێشکەوت، منیش دوا بەدوای ئەودا دەڕۆم، لەهەر چرکەیەکدا نەخشەی هەزار کارەساتم دەکێشا، ئەوی نەیدیت بێ نازانی، گەیشتنەوە لای بەرزەکان دیسان دانیشتەوە گوتی: مەمەندی پیاوی شاری خەزنە دانیشە با سەرگوزشتەی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، چیترت لە ترس‌و پەستی نەهێلمەوە، زوو وەرمگرتەوە بفەرموو شای پاڵەوانان، پاڵەوانی لەمەمەندی پاڵەوانتر.

من لە بنەماڵەی ئۆغەنی... مە، ڕەنگە لەدوورەوە ناوبانگی ئەو خانەوادەیەت بیست بێ، هەر سوارێك لەئێمە بەهەزار سوارییە، لەشەڕی... پیاوەکانمان، ئەوانەی ناوداربوون بەرامبەر دوژمن خاکەکەمان کەچ نەکرد، بوونە قوربانی خاکەکەیان، دوو برای مێرد مندالم مابوونەوە، زریان‌و زیرەك، تازە دەهات فەراقە بن، هەر یەکەیان نموونەی قارەمانێکی دواڕۆژبوو، ئەم هێزی شەڕەی لەبەر دەستدایە، نەیان هێشت پێڕا بگەن، کوشتنیان، چار ناچار سوێندم خوارد سەری من نەچتە سەر بالیف، گشت خۆشیەکی جیهان، ژیان لەمن

قەدەغە بێ تا تۆڵەی ئەم دوو بێچووە شێرە نەکەمەوە، تا تۆڵەی ئەو دوو نازدارانە نەکەمەوە، پاش تۆڵەکردنەوە هەناسەو پشووی خۆشی بنۆشم، بیرم لەوەکردەوە، دوای تۆڵەکردنەوە پێویستم بەکەسێك هەیە، پیشتیوانم بکات، ئەو خۆشییەی لەدەستم چووە، بۆم قەرەبۆ بکاتەوە، بۆ ئەوە لەدوا ڕۆژدا، کڕبوو، ناوبانگی هەر پاڵەوانێکم دەبیست، شەوێ دەچوومە سەری،بانگم دەکرد، بێکەلم دەهاتنە بەرچاو، سەر قەلدەدان، ئەوە ماوەی شەش مانگە بەم هەرێمەدا دەسوڕێمە، تا تووشی تۆ بووم، ئەوەندەش تۆم بەدڵنەبوو، نەمویست پتر خەلك لەختوخۆڕایی بکوژم، بەزەردەخەنەوە ڕووی تێکردم: من خاتوونە پەری کچی....مە ویستم پیاوێکی مەرد بدۆزمەوە، پشتیوانی تۆڵەکردنەوەکەم بکات تا لەباتی بیکەم بەهاوسەری ژیانم، ئەگەر ئارەزوو بفەرمووی هەر لێرەوە تۆ ڕابەرو هاوبەشی ژیانمی، لەسەرخۆ جلکی شەڕی سەرەوەی داکەند، ئافرەت چ ئافرەت نەبکەی نەبخۆی هەر تەماشای سای گەردەنی بکەی، مێوژە ڕەشەکەی بخوا لەگەرووی دیار دەبێ، تیشکی زیونی مانگ لە..........دەدا، ناتزانی کامیان لەکامیان جوانترن.

بەجووتە بەرەو شاربوونەوە، پاش ساڵێك ئەو حەسەنەمان بوو، ئەو جا پاشا ژن هەیە ...خراپەکارو بەدڕەوشت چ ژن، چ پیاو یەکە، ژن، پیاو، چەندی بیری بڕ بکات ماڤ ئەو دەسەلاتەی هەیە.

سوڵتان وەکو گوڵێکی ژاکاو گەشایەوە، فەرمانی لێبووردنی بۆ حەسەن و هەموو زەرییەکانی شار دەرکرد.

خراپەکار بە خراپەی خۆی گەیشت، لەبەر ئەنجامی چاکەش نائومێد نابێت.

84- ا – ژن ببونە گەورەی ماران، گیسکان دەبڕیەوە، کاوڕیان دەهێشتەوە.

ب- تەگبیرکەری ماری ژن بی گیسکی ساریٚ دووجار بڕبی.

دەڵێن لەم کوردەوارییە ساڵێك سەرداری ماڵان ژن بوون، پیاوان کاروباری ماڵەوەیان دایە دەست ژنان، گۆتیان با ژنان ئەزموون بکەین بەڵکو بۆچوونی وان، هەڵسوڕانی ئەرکی سەرداری ئەوان کەلك بەخشتر دەبێت.
ژنان چی بەکەڵکی وان هات ئەوەیان دەکرد بەهار ڕۆیی هاوین هات، مەڕو کاوڕیان نەبڕیەوە، هەموو لەبن خوریدا سووتان، گیسکان دووجار بڕیەوە، مەڕو ماڵات قڕیان کرد.

**86- سەلاموعەلێك ئاغەی دەنگنەکەر، پیلەکەم دڕا قۆرم هاتە دەر، بە ڕۆژە ڕۆژە سارت بردە سەر.**

ڕەنجبەری کابرایەکی دەوڵەمەند، جلك و بەرگی دڕابوون، هەموو ڕۆژێ دەهاتەوە لەسەر جەمێ دەیگۆتە خاوەن ماڵەکە فلانی بەرگم دڕاوە، خەلکی گەمەم پێدەکەن دەڵێن ڕەنجبەری فلانی چی لەبەرنییە؟ ئاگری بەردەیێ بۆن سۆی لێنایی، بۆ هەردوو لامان ناشرینە.
ئاغەکە: ڕاوەستە دەستمان بێتەوە بەرەخۆ.
ڕەنجبەر ڕۆژێك لەخۆ بێزاربوو وتی: سەلاموعەلێك ئاغەی دەنگنەکەر، پیلکەم دڕا قۆرم هاتەدەر، بە......... .
* ئەم پەندە بە کەسێکی کەمێك چاو برسی پشوو کورت دەڵێن.

## 87– ستیلەی نان لەسەرخۆ، ستیلەی کراس لەخۆ، سەکۆ بیبە بەخێراخۆ.

دەڵێن ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، من دەڵێم ئافرەت هەموو شتێکە لە کۆمەڵ، ئافرەت پایەی زۆر لەوە بەرزترە بیر تەسکان بۆ یچوون. ئافرەت کە سەرچاوەی هێناکایەی مرۆڤ بی، ساردی گەرمی دەرەوە، هیلاکی ماڵەوە هەمووی لەئەستۆی ئەو دابێ... کەواتە کەسێك لەکانی وەتمانی دەموچاوی نەشووشت بێ ماف ئەوەی نییە لە ئافرەت بدوێ، ئافرەت کەدەسەلاتی هێز نوادنی نەبێ، زۆر بە ووردی بیر دەکاتەوە، بڕوا بەخۆ دەکا، ژیری دەنوێنێ، ئەنجامی مەبەست یەکسەر دەپێکی، بەهەستە ناسکەکەشی زوو هەست بەچاکەو خراپە دەکات، سینەشی کۆگای نهێنی منو تۆیە.

ستیلە بێوەژنێکی ناسك بوو، پلت لێدایە دەپەڕی، خاوەن سامانێکی زۆر بوو، سەعۆ یەکێك بوو لە سۆرەو تۆرەکانی هیچی نەبوو ستیلە بەنا بەدڵی شووی پێدەکات، سەعۆ تێربوو، تیێپەڕاند، ستیلە چی لەدەست نەما با دەیگوت ستیلەی نان لەسەرخۆ، ستیلەی کراس لەخۆ، سەعۆ....... .

## 88– سۆفی هەمینۆ، خۆ بچەمینۆ، مارەیی من و تو، لە عاسمانێ هاتینۆ.

کابرایەکی کرمانجی ئەو سەرەوە، خۆی کردبووە شێخی تەریقەت، هاتبووە ئەو دەشتی قەراجەی هەولێرێ، ژنو پیاوی تەریقەت دەدان، دەستەو داێیرەی زۆر بوو بوو، یەکێك لەم دەروێشانە سۆفی هەمین بوو.

ڕۆژێك خروەخانەی چول بوو، شێخو سۆفی هەمینۆ مابوونەوە، شێخ لەهەمینۆ نزیك بووەوە، سۆفی هەمین گوتی: بە قوربانت بم بابە شێخ ئەدی مارەیی؟ ئەوها حەرامە.

شێخی نا شێخ گووتی: سۆفی هەمینۆ، خۆ بچەمینۆ....... .

* ئەم پەندە بە کەسێکی فیلباز دەگوترێت، خۆ بکات بەپیاوی چاك بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆی کە نێوار نەما ڕاستییەکەی دەربکەویتەوە.

## 89- سێوەك بووم لە سێوی ملکی، کەتمە دەست مل بە چرکی، نازانم نەبۆ خۆیم دەخوا نەدەمداتە خەرکی.

وشەی ئازایەتی بەپێی ڕۆژ، سەردەم لە خەڕەك دەدرێت، لەمەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی تر گۆڕانی بەسەردا دێت.

سەردەمێك لەم کوردستانە ئازایەتی ئەوەبووە، زۆری لەمولەو، هاونیشتمانی خۆت بکەیت.

کابرایەك خوشکێکی زۆر جوانی دەبێت، بەخۆشی دەتگوت قوڕە پەستە، نەفرەجایەك بوو لەو گۆڕەی.

لاوێك لەدوورەوە دەست ناوبانگی کچەی شۆخو شەنگ دەزانێت، سەودای دەبێت، داوای دەکات نایدەنێ، دەڵێن تۆش خوشکت هەیە، وەرە ژن بە ژنی بکەین، کارەکە چەواشە دەبێت، خوشکی لاوە شوو بەکابرا، سەروپێچکی چانەکرای ناکات.

کوڕەی شەیدا هەر چەندی دەکاتو دەکات هیچ لایەکی بۆ ئەنجام نادرێت، ناچار ڕۆژێكو دووان لەم ڕێ بۆ ئەو ڕێ پرسیار بە پرسیار ڕووداوەکە ڕوونو ئاشکرا دەبێت، ساڵێك نا دوو ئەم جارە کابرای زۆر لێکراو چەند دۆستو پیشتوانێکی بەتوانا لەگەڵ خۆی دەبات، تخووب دەبەزێنێت دەچێت خوشکی کابرای قرە بڕ دەکەن سواری ولاغی دەکەن دەیهێنن شەو درەنگ دەگەنەوە ئاوایی، کچە لەچارەنووسی خۆی نەدەگەیشت کەسی لێ نانسین، هەر ئەوەندە نەبێ، کابرایەکی چلکن سەرپەرشتی دەکرد لەناو گوندی هاواری دەکرد، دەیگوت: سێوەك بووم لەسێوی مولکی....... .

* ئەم پەندە بۆ کەسێکی لێوەشاوەیە زۆری لێبکرێت، چارەنووسی خۆی نەزانێ.

**90- ا- شان بە قوڕ لەخۆ بەشکە.**

**ب- گاسن دز لەخۆ بەشکە.**

ئەم ڕووداوە دراوەتە پاڵ میر محەمەدی مەزن، پاشی کوڕە، چاوێکی قیچك بووە، بەم شێوە دەبێتە ئەدەبی میللی، بەڵام ئەم قسانە لەناو کوردا پێشتر باوبوون بۆیە زیاتر بەرفۆلکلۆر دەکەوێت.

کاروباری فەرمانڕەوایی ڕواندوز تا دەهات بەرەو کزی دەچوو، مستەفا بەگ، باوکی میر محەمەد، دوو دڵ بوو، جلەوی کاروباری وڵات بداتە دەست کوڕە گەورەکەی، چونکە دەیزانی براو برازاکانی خۆ تووشی سزادانێکی قورس دەکەن، بەدەستییەوە. ڕۆژێك لەخۆ بێزار بوو، ڕاسپێرێکی ناردە دوای لە چۆلە مێرگ، ئەویش وەك باشووکە بەرەو ڕووگەی گوردستان کەوتە ڕێ، بەدەم چاوەنواڕی کارەساتێك یان گۆڕانێکی نوێوە، بەهەناسە بڕکێو پەشۆکاییەوە، سەلامی لە کوڕی دیوەخان کرد، سەلامیان وەرگرتەوە.

میر محەمەد باوە بفەرموو، چ فەرمانێکت هەیە، ئامادەم.

باوکی میر محەمەد: ڕۆڵە ئێستا دانیشە، پشوێك بدە، هێوارە هەموو شتێك تێدەگەیت، نوێژکرا، خوانچەی بەدوا داهات، نان خورا، دەستو دەم شوورا، مستەفا بەگ: ڕۆڵە با بەرەو ماڵ ببینەوە، دانیشتنێکی تایبەتیمان هەیە، دایکیشت بەشداری کۆبوونەوەکەمان دەکات، دایك بەپیر جگەرگۆشەیەوە هات، هەردوولا ڕوومەتی ماچ کرد، گوتی دایك لەبەر ئەو بەژنو باڵایە گەڕێت، لەسەر ڕایەخە ئۆرتەکە دانیشت، کەوتنە ئاخاوتن، میر محەمەد هەستی مەستییانی کرد، کپو ماتو بێدەنگ بوو، خەرکی لێك دانەوەی خۆی بوو،

چۆن دەتوانێت باری ئاڵۆزاوی وڵات ڕاست بکاتەوە. باوکی ڕووی دواندنی تێکرد، میر محەمەد کوڕم من و دایکت وامان بەباش زانی تۆ لەشوێنی من دانیشی، ببیت بە میری سۆران، ڕۆڵە من پیربووم، ئارەزووی زەبرو زەنگ نواندنم نەماوە، براو برازاکانم بەیەک جاری دەست لەکاروباری وڵات وەردەدەن.

دایک ڕاست بووەوە، ئۆخەی خۆشەویستی دایێ، دڵی دایک و باوکت مەشکێنە.

محەمەد هاتە زمان باشە بە چەند مەرجێك.

دایك و باوك دڵنیای مەرجەكانیان كرد، بەرەو دیوانی بارەگا گەڕانەوە.

## 91- شەقریان شکاندی!

لەگوندێکی دەڤەری ئەم شارە، پیرەمێردێکی زۆر سادەو ساکار هەبوو، لەبەر کەنەفتی هیچ کارێکی پێئەنجام نەدەدرا، لەبەرهەبوونی ژنێکی پاش خوالێخۆش بووەکە هێنابوو، ژن هەر ناوی ژن بوو.

ڕۆژێك باراشیان نامێنێ، ناچار ژنە دەچێتە ئاشی، جاران ئاشی ئاویێ نۆبەتی بۆ دەگیرا، باراشهێڕەکان سکیان بە ژنە دەسووتێ، بەبێ نۆبەت دێڵن باراشی لێبکات، ژنە پاش نیوەڕۆ بەحەوشەی دەکەوی، باراشی لێکردبوو!

پیرەمێردی زماندرێژ: ها ژنەکە، نۆبەت گرت؟

ژنەکە لەسەرەخۆ پیاوەکە باراشهێڕەکان، خوا خێریان بنووسی، بەبێ نۆبەت باراشیان بۆ لێکردم.
پیرەمێرد: شەقریان شکاندی!
* ئەم پەندە بۆ کەسێك بەکار دێت، گومانێکی لەخۆڕای ناڕەوای بۆ دروست ببێت.

## 92- شێخ شەروان، گومەتی هەرناگری.

شێخ شەروان، شێخێکی ناودار بووە، لەدەشتی هەولێر، گوندەکەش بەناوی وی ناونراوە، گۆڕەکەی لەخاکە سوّرکەرانێکە شەق شەق دەبات، زۆرجاران گۆمەزی لەسەر کراوە، گۆمەزی کەرپووچ خرادەبی، بەبۆ چوونی پیاوە ئایینەکان ئەو دەڤەرە ئەمە لەبەر بێفیزی چاکەکە- شێخ شەروان- بەگۆمەز خرا دەبیت.
* ئەم پەندە بۆ کەسێك دەگۆترێت شتێکی باشی بۆ بکرێت لەبەر هۆیەکی تایبەتی خۆی نەیەوێت.

## 93- عەولا ڕەشە ، ئەو هەر بەشە.

عەولا ڕەش لەبەر بێنەوایی و هەژاری ، دەچووە هەموو مالأنی گوند بەشداری خواردنی هەموو خوانەییێکی دەکرد ئەمرۆ لێرەو بەیانی لەماڵێکی تر کوێندەر خۆش بوو ئەو لەوێ بوو، وای لێهات کابانەکان بەشی عەولا ڕەشیشیان دروست دەکرد تابووە بە پەند: عەولا ڕەشە ، ئەو هەر بەشە.
* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن خۆی بکاتە بەش وە یار هەر شتێکی بە کەڵك و لەبەرژەوەند خۆی لێبکات بە بەش.

### 94- فسۆغلییە، ئێوارە بەسەر فەرخەی خۆیدا دەفیسی.

فسۆغلی، فیسقەگولەیە، شەوان لەناو هێلانەی خۆیدا بیردەکاتەوە، دەڵێت: من باڵندەیەکی پڕ لەزاخم، بەوەجم، بەیانیم لێبدات، بەسەر باڵندەکانی هاوتوانام دابفسم سپیدەی بەیانی دێت، دەست بە جوقە جوقێ دەکات، هیچی لەدەست نایێ کە ئێوارە دەگەڕێتەوە بەسەر فەرخەکانی خۆیدا دەفسی.

* ئەم پەندە بەکەسەێکی بێتوانا دەڵێن، لەناو دەروونەوە خۆی بەزیاتر بزانێ.

### 95- فیتە لبەڕ فیتی کرد، ئەسمەر کراسی چیتی کرد.

دەڵێن لەیەکێك لە گوەندەکانی ئەم دەڤەری هەولێرە، پیاوێك هەبوو ناوی فیتە لبەڕیابوو پیاوی ئاغابوو، ڕۆژێك لەشەڕێکدا دەکوژرێت، زۆری پێناچێ ژنەکەی کراسێکی چیتی دەکات.

خەڵکەکە دەڵێن: فیتە لەبەڕیا فیتی کرد، ئەسمەر کراسی چیتی کرد.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن باکی بەکارەساتێکی گەورە نەبێ، بکەوێتە دوای ئارەزووی خۆیەوە.

### 96- قازو قورینگ کەچەرو کۆران، هەراوێرن.

قازو قورینگ لەکوێستانان دەگەڕێنەوە، وەیا دەچن، بەشێوە فڕینێکی ئەندازەیی هۆنەری دروست دەکەن، بە چریکەی خۆش، دەرچریکێنن.

منداڵان لەسەر زەوی بانگیان دەکەن: قازو قورینگ کەچەرو کۆران هەراوێرن.

* ئەم پەندە هی ژنانە، بۆ جودا کردنەوەی خراپ و چاکە.

### 97- قۆنگرو قەرات، بە بنەوە هات.

ئەم پەندە ئاماژە پێکردنێکە، بۆ کارەساتەکەی دمدم بەسەرۆکایەتی خانی لەپزێڕین.

ئەسعد خانی برادۆستی لەساڵی (1607)دا باوڕی بە تورکەکان نامێنێت لەگەڵ شا عەباسی سەفەوی بەندکارکیان تێکەڵ دەکەن، بەماوەدانی یەکەمیان قەلای دمدم دروست دەکات، نەیارانی شا عەباسی لیٚ هاندەدەن، شەڕێکی قوڕس لەنێوانیان ڕوودەدات، ماوەی ساڵێك شەڕەکە بەردەوام دەبێت تا ئەحمەد بەگی لێتانی ڕووی ڕەش بی لەگەڵ شەیتانی گزی لەگەڵ دەکات، کاغەزێکی لەسەر ڕمی دادەنیٚ بۆ دوژمن دەهاوێژێت، دوژمن کاغەزەکە دەخوێنێتەوە، سەروچاوەی ئاوی کانییەکەی قەلای دمدمی بۆ ئاشکرا دەبێت.

دوژمن سەرچاوەی ئاوەکە پڕ زبلو هەش دەکات، وەڵامی کاغەزی شێخ مەلا ئەحمەد بەگی جزیری بەپێچەوانە بە دەست دەگات، ناچار لەگەڵ شا عەباس بەچەند مەرجێك ڕێکدکەوێت، مەرجەکان فڕوفێڵ بوون، داونانەوەبوو، بۆ لەناوبردنیان.

* ئەم پەندە بە ڕووداوێك دەگۆترێت، ئەنجامی بەماتەمینی و خراپە بێت.

## 98-قوربانت بم کوڕی سێو لەباغەریٚ.

کیژێکی فێلباز لەدروێنە دوا کەوت بوو، زانی بەیانی زبارەیان بۆ دەچێت، کۆمەڵە سێوێکی بە قەنەفلی دەنەخشێنێت، بەنهێنی لە باغەلی پاڵە لاوەکان دەنیٚ، تا هەموو سێوەکان لەسەر کەسە لێوەشاوەکان تەخشو بەخش دەکات، جار ناجارە لەبەری دروێنە دەیگۆت: قوربانت بم...... جاعێلان هەندەی تر گوڕیان دەستاند، بۆ ئێوارە تەبارە شڕبوو، ئێوارە بەرەو ماڵ گەڕانەوە یەکێکی زیرەکیان تێدابوو، گوتی کوڕینە، لەو بەزمو سەرخۆشو ماندووبوونەی

هەموو لامان، هەست دەکەم فیێڵمان لێکراوە، بەقەسەکەی ئەو ڕوون بوەوە، هەر کەس سێوی خۆی دەرهێنا خواردیان، بوو بە تریق و هۆڕی پێکەنین.

* ئەم پەندە کەسێك دەیڵێت یەکێکی ساویلکەی پێ لەخشتە ببات، بۆ مەبەستی خۆی بۆ ماوەیەکی تایبەتی.

## 99- قەلە ڕەشکە لۆ چاکە ناقڕینی.

دەگێڕنەوە دەڵێن لەم کوردستانەدا، پاشایەك هەبوو، تووشی گۆڕووتی هات، چەند نوشدارو مام مۆرتك و پیتولی قەلەمڕەوەکەی هەبوون کۆیان کردنەوە، تا چارەیەك بۆ ئەو نەخۆشییە پیسە بدۆزنەوە، هەموویان کەوتنە ئەو باوەڕە، دەبێت شای باڵندان بگرن، باڵی بکەن، لە ژوورێکدا بەری بدەن، تۆزو خۆڵی بەرپێی هاتوچۆکردنەکەی بەسەردا دەڕوات، بە برینەکەکانی وەر بکەن دوور نییە چاك بێتەوە خەڵات و پاداشێکی زۆر چاك تەرخانکرا بۆ ئەم مەبەستە شای فڕندان کیستان و گەرمێنی دەکرد، وەرز گۆڕا، گەرماتینی ستاند، باڵندەکان بەخۆکەوتن لەکڕی خۆی دەستیان کرد بە کۆچ کردن، بە ئاسمانی کەوتن، فڕین فڕین ئەو بەرزە فڕانە هاتن نزیك چیای... بوونەوە، زۆر ماندوبوون، برسیەتی و تینوویەتی هیلاکی کردبوون لەهەموو لایەك داو دانرابووەوە.

شای باڵندان سەیری کرد، دوونگی چەور، گۆشتی قەڵەو، بەرخۆڵەی بەستراو... بەر چاو دەکەون، بۆ ڕاست و چەپ ڕووی خۆی وەرگێڕا، لایەك باز، لایەك شەهێن، لەم لاو لەولای بوون، شا: چ دەڵێن لەم خواردنانە، جەمێك تێر بخۆین، وا دیارە برسیەتی هەموومانی هیلاك کردووە، هەر یەکەیان: پاشام خواردن لەم شوێنانەدا مەترسیان لێدەکرێ بابچینە شوێنێکی بێترس،

پاشامان سەلامەت، خۆمان چۆن لێڕاهاتووین، خواردن و خۆراکی خۆمان دەخۆین.
ساڵێك و دووان، شای فڕندان لەخۆبایی بوو، وورده وورده دەمڕاست و جوامێرو دەستو پێوەندەکانی بەقەله ڕەشکەو سیسارکه کەچەڵ و داراشو ... گۆڕییەوه.
پایزێك بەرەو گەرمیان دەگڕانەوه، هاتن تووشی شوێنی نێچیری بەداو بوون، شا ڕووی کرده دەسته چەپو دەسته ڕاستی گوتی: برادەران، نەنیشنەوه لەم خواردنه تەڕو تازانه تێرو پڕ بخۆین.
سیسارکه کەچەل سەری له بن گوێی داراشو قەلەڕەشکەی نا: کوره ئەوێهێ واهەست دەکەم مرۆڤه خۆی له سپیرناوه، پروشو پەراشی بەسەرخۆدا کردووه.
قەله ڕەشکه گوتی: لێی گەڕێ، هەر به لایەك بێ، لەپێشدا تووشی شا دەبێت، گۆشتەکەی چرە ناخورێت، فڕێیدەدەن، خۆمان دەیخۆین.
قەله ڕەشکه قڕاندی دەیبفەرموو پاشای گەورەمان، تۆ بنیشه تێرو پڕ بخۆ، ئێمه ئاگاداریتان دەکەین تا تێر دەخۆیت.
باشووکه بەتەنیا یەکێك بوو له پیاوه ماقوولەکانی مابوو، گوتی: گەورەم مەنیشه دەترسم شتێکت بەسەر بێت، قەلەڕەشکه بۆ چاکه ناقڕینی.
دامودەستگا دایانه قاقای پێکەنین گوتیان: ئا سەیر کەن خەریکه زراوی شادەبات چەند ترسنۆکه: وادەکات ئێمەش بڕوامان لاواز بێ.
شا چاوی چووه پشتی سەری گوتی: دیاره تۆش باشووکه وەکو بازو شەهێنی نزیکه بمتۆقێنی ئەو شایەتییەم چۆن پێدەکرێت، قسەی وا له ڕووی من دەکەی دیاره دەتەوێت لێمیاخی بیت، بڕۆ بۆ کوێ دەچیت بچۆ بەرچاوم بەرده، ناچار له تەشکی خۆیدا ڕۆیشت.

**شای باڵندان بەو پەڕی لەخۆ بایبوونەوە لەسەرەخۆ بۆلای نێچیر هاتەوە خوارەوە، قەلەڕەشکە ڕاوچییەکەی بەدی دەکرد، گوتی لێی گەڕێن با ئەم بەزمو سەیرە ببینین، شای خواگرتوو لە سەر بەردیلە بەپشتەکی وەرگەڕایەك نیشتەوە، تەپ بەداویٚ وەبوو، قیرە بڕیان کرد. دامودەستگاکای بۆ ئاسمان بەرزبوونەوە، پەرتەیان لێکرد.**

**کابرای ڕاوچی بەخۆشی خۆشی بۆ پادشای شاری برد، بەخشیشەکی زۆر باشی وەرگت، پاشای گڕووبووی، لەشای فڕندانی پرسی: ئەوە چەند ساڵێکە بەدواتا وێڵو سەرگەردانین بۆمان نە دەگیرای، چۆن ئەمجارە وا بە سانایی و گێلانە کەوتییە داوی فێلبازییەوە؟!**

**شای فڕندان: هەر کەسە چاکە بەخراپە، ڕاستگۆیی بەدووزمانیو سەختە بازی بگۆڕێتەوە وەکی منی بەسەر دێت، شەهێنو بازم بە قەلە ڕەشکەدا، قەلەڕەشکەش بۆ چاکە ناقرێنی.**

**پاشا گوتی : مەرج بێت داو دەرمانی خۆم دەکەم، چاك ببمەوە بەخێوت دەکەم تا زۆر چاك پەڕو باڵت دێتەوە، بەرت دەدەم، بەڵام جارێکی تر تا نانو پیازێك لەگەڵ کەسێك نەخۆیو ئەزموونی نەکەی پشتی پێنەبەستی.**

## 100- کاکەم سوار بوو لە گەرسواران، بەفر ڕەویەوە لە نساران، گوو بەڕیشیٚ کادینداران.

**تا ژیان لەسەر ئەم گۆی زەوی مرۆۋ نشینەدا هەبیت، زنجیرەی ڕووداوی نەپچڕاومان هەر لەبەربوونەوەدا دەبیٚ، ئەم ڕووداوانە دەبنە چیرۆك و سەرگوزشتەی بەکەلك، بەسەربردنی ژیانی ئەم کوردستانەی ئێمەش ڕووداوی لیٚ ڕووداوە، بەشێکە لەم بینەو بەردەی ڕۆژگارە، لەم کێشەیە بەسەرهاتی وا هەن گەلێك پەندو ئامۆژگاری جوانو بەنرخی لیٚ هەڵدەهێنجرێت، ئاسۆی بیرمان پیٚ فراوان تر دەبیٚ.**

لەم دەشتی هەولێرەو سەرتاپای کوردستان بەگشتی، سەردەمێك باو هەرباوی سوار چاکی بوو، بە پێی نەریتی ئەو سەردەمە هەر کەسە نانی هەبووایە، وەیا خۆی بە پیاو بزانی بووایە، دەبوو پیادە نەبیٚ، ولاٚغێکی سواری هەبی.
ساڵێکی قاتیو قووتی زستان وەکو دەڵێن یان سەروەشێنە یان دوا وەشێنە، درێژەی بە بەفرو زریانو کرێوەدا،ماڵی مام باپیری ئالیکیان نەما.
پیرۆتی برا گەورە: دەی خوشکم، ئاسکۆڵ، بڕۆ لەماڵی مام وەیسی، بزانە چەند چارۆگە کایەکی بۆ ئەسپ شیٚ ناهێنی، هەر چەند دەکەم نانم پیٚ ناخوریٚ.
کچە ئاسکۆل: کاکە گیان، من ئافرەتێکی ڕوو سوورم، چۆن بچمە مالاٚن، بۆ بەخۆت ناچی؟
کوڕە: خوشکم، چارچییە هەر دەبیٚ تۆ بچی، ئەگەر نەش دەنە تۆ هەر دەبیٚ، ئەگەر نەدەنە من دەبیتە دوو لێقەومان!
کچەی ڕوو سوور، ناچار دەست بە ڕووی خۆی وەدەگریٚ، بەرەو ماڵی کوڕە دەخشیٚ هەر هەنگاوێك وێنەی هەزار کارەساتی نەخشە دەکێشا، کچە نزیك بووەوە، سەلاموعەلێك. کوڕی مام وەیسی بەتاقی تەنیایی لەماڵەوەبوو، وەلاٚمی دایەوە، وەعەلێکە سەلام، بەخێربێی سەرچاوان، ئەی میوانەکەی چ جار نەهاتی بفەرموو.
ئاسکۆڵ: کاکم سەلامی لێدەکردی گوتی، پاشۆلە کایەکمان بداتیٚ، ماینەکەمان دوو ڕۆژە چی نەخواردووە!
کورد دەڵێت چەم بێچەقەل نابی.
کوڕە : باشە ئەگەر.......
ئاسکۆڵ: جوان بدویٚ با باشت تێبگەم.
چی بمەویٚ ، بە گوێمدەکەی؟

ئاسکۆڵ، کاکە بۆ شەپۆپەت شێواوە؟
کوڕە، گیانەکەم لەدەست خۆم نییە، وەختە بۆت شێتو هاربم، ئەگەر ماچێکم بدەیتی هەموو ڕۆژێ چارۆگە کایەك ببە.
ئاسکۆڵ: برا من چ ڕۆژێك ئاوڕم لەتۆ داوەتەوە؟ هەتا وا ڕووبەروو دڵم بشکێنی.
کوڕە: بە قوربان ، توخوا قسەی ناخۆش مەکە.
ئاسکۆڵ: تازە ئەو برینە بەهیچ دەرمانێك تیمار ناکرێت.
کوڕە : قسە ڕەقەکانت سەرسەرم هۆشت بێنەوە سەرەخۆ، من هەبووەم دەتوانم لەبەر زێرو زیوت بگرم.
ئاسکۆڵ : بەکورتی باشی تێبگە، ئێمە ماینی حەدوود لە پیرە کەرێ چاناکەین!
کچە بەرەو ماڵ دەبیتەوە، براکەی، ها دەست بەتاڵ گەڕایتەوە؟!
ئاسکۆڵ: کاکە خەمی مەخۆ، خوا یار بی، خوشکت ساغ بی، لەچاوە دینی دۆست و دوژمنان ماینت بۆ دەردەبەم، لەپاش تاڵی خۆشیە.
براکە: هەموو هیواو ئاواتم ئەوەیە ئەسپەکەم دەربچێ، لە برسان نەتۆ پێ.
ئاسکۆڵ: خودا پشتیوان بی خوشکی دڵسۆزت، ناهێڵێ هیچی بەسەر بێت، پیشەقانێکی بەدەستەوە دەگرێ، دەچێتە ناو زوورگەکەی بەرماڵان، بە پیشەقانی فریزی لەژێر زەویێ دەردەهێنێ، ڕۆژانە پاشۆلێك دەکات، دەگەڕێتەوەماڵەوە، لەپێش ئەسپی ڕوو دەکات، تا گەیشتە گیا شینکەی دەرە بەهارێ، خۆشی هەموو لایەکی گرتەوە. ڕۆژێك کچەکە دیتی وابراکەی سواری هەسپی خۆی بووە لەگەڵ کۆمەڵی سواران، کوڕەی گۆرینشیان لەگەڵ بوو گوتی : کاکەم سواربوو لەگەڵ سواران........... .

## 101- کاوجۆ لەبەر سەی، هێسك لەبەر هەسپی- هەسپ-

ئەم ڕۆژگارەی ئێستا ئێمە لێی دەژین، سەردەمێك باو باوی هێزو بازوو بووە، كۆی چاو نەترس و نەبەردبووە ئەو كەسە پاڵەوانی بووە. ئازایەتی بەپێی سەردەم گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەوەی دوێنی بەباش دەزانرا، هیچ دوور نییە، ئیمڕۆ ئەو نرخەی جارانی نەمابێت، ئەوەی بەدەگمەن بیری لێنەدەكردەوە، ویردی قارەمانیەتی سەردەم بێت، بۆ وێنە دەڵێن: باوكێكی كەنەفت، بازیبەندی هەبوو، دایە كوڕە تاقانەكەی پێی گۆت: ڕۆڵە لەسەر قۆڵی ڕاستتی ببەستە، هەتاماوی لەبەری نەكەیەوە، پەكت ناكەوێی، كوڕە بازیبەندەكەی بەست.

ڕۆژێك كوڕەكە لەسەر ڕوبارێك خۆی ڕووت كردەوە خۆ بشوات، دایكە دێوێكی لێ پەیدا بوو، پڕیدا بازیبەندەكەی، كوڕە توند گرتی لەمی كێش لەوی كێش.

دێوەكە گۆتی: پیاوی چابە، بازیبەندەكەم بدەرێ ئەگینا لەناو دەچیت.

كوڕەكە گوتی: گیانم دەربچێت ئامۆژگاریەكەی باوكم نەشكێت!

دیوە باڵی گرت و بەئاسمانێ كەوت، بەبازیبەندەوەی برد لەناوەندی حەوت دەریایانی دانا.

دێوە شوێنێكی تایبەتی هەبووە لەم شوێنە بە كوڕەكەی گۆت سێ مەرج هەنە ئەگەر بەجێیان بگەیەنێ چیت بووێت بۆت جێبەجێ دەكەم دەنا ئەتو لە چنگە من دەرباز نابێت بچییەوە!

بەیانی دێوە ڕاست بووەوە، كلیلەیەكی دایی گۆتی، هەڕووە ئەم ژوورەی بزانە چ دەبینی!

نیوڕانی خواردن و قاوەو قەڵنەم بۆ ئامادە بكە، هەتا لە ڕاوشكارێ دەگەڕێمەوە.

کوڕە بەکش و ماتی، دڵی لەهەزار ئاشی لێدەکرد، چوو دەرگەی کردەوە چ ببینی، سێ کیژی ئەوەندە ناسك و نازداری تێدابوو، بەدرێژی تەمەنی خۆی شلکە نەمامی واجوانی نەدیت بوون لەمێژبوو کەسیان نەدیت بوو بە ئەحمەدی شاگەشکە بوون، تا بەرەبەری نیوەڕۆیان پێکەوە بردە سەر.
ئەحمەد داوای لێکردن ماوەی بدەن بە جێیان بهێڵێت، گۆتیان بەمەرجێك ئەگەر دێوە تۆی بەر هەڵدا دەبێ ئێمەش ڕزگار بکەیت.
هەتا دێوە هاتەوە هەرچی فەرمایشتی لەسەر بوو جێ بەجێکرابوو، چاوەنواڕی گەڕانەوەی دەکرد، کاتێك دێوە وەك زریانێك هاشەی هات پەیدابوو!
ئەحمەد مەرجی یەکەمتم بەجێگەیاند یان نا؟!
دێوە پێ دامەگرە، ئێوەی مرۆڤ چاو تێرنین!
بەیانی دێوە کلیلی دووەمی دایێ گوتی: هەروە ئەم هۆدەیەی، ئەحمەد چوو، سەری بە ژووری داگرت هەندێك مرۆڤی لێ بەداری وەکرابوون، هەبوو مردبوو، هەبوو هەر ئەوەتە مابوو، هەبوو لەکۆت و زنجیردابوو، هەش بوو بەلاقێکی بەداری وەکرابوو... هەمووی رزگار کردن، کۆت و زنجیری لەپێوەدەستی کردنەوە، هەتا پێش نیوەڕانێ خزمەتی کردن، دوایی چوو خواردنەوەی بۆ دێوە ئامادە کرد، خۆی بۆ پێشوازی ئامادە کرد.
دێوە وەك گەردەلوولەی پایزان ئامادەبوو.
کوڕە: دووەم مەرجم جێبەجێ کرد یان نا؟
دێوە: بەڵێ تەواوە.
جاری سێیەم دوا کلیلی دایێ گۆتی بڕۆ ناو ئەو خانووبەرەی بزانە چییان تێدایە. ئەحمەد چوو دەرگای کردەوە، دیتی سێ هەسپی لێبەسترابوونەوە، یەك ئی بای، یەك ئی دەریایی، ئی سێیەم هی بارانێ: ئیسك و پروسکیان

لەپێش دانرابوو سێ تانجیش بەسترابوونەوە، کاوجۆیان لەبەر دانرابوو، چوو جێگۆڕکێی پێکردن پێش نیوەڕۆ ئەرکی پێسپێراوی گشت جێبەجێ کرد، لەپێشوازی ڕاوەستا لەناکاوێك هاشەیەك هات دێوە هاتەوە.

ئەحمەد گوتی : ها تەواوم کرد یان نا.

دێوە بیری کردەوە، مەرجەکانی هەر سێك بەجێگەیاندوون ، گووتی تەواو، زۆر پێ دامەگرە، لەسنوور دەرچوون ڕاست نییە!

ئەحمەد گوتی : یەکەم هەر سێ کچی ژووری یەکەمم دەدەیتێ، دووەم ئەو مرۆڤی بەگیان ماون بەریان هەڵدەدەی، سێیەم ئەو سێ هەسپ و تانجی لەژووری بەسترانەوە دەمدەیتێ.

دێوە مەرج کراوە! هەمووی بۆ جێبەجێ کرد.

کیژەکان، یەك کیژی شای پەریان بوو، یەك کیژی پاشای ڕۆژهەڵاتی بوو، یەك هی ڕۆژئاوایی بوو.

دێوە بازیبەندو دەستە جلکەکەی داوە ئەجمەدی گوتی لە بن جلك و شمەکەکانی خۆت لەبەربکە، کیژی شاری پەریان نەیبینێ نەخۆ دەیباو لەچاو وون دەبی. خۆی و کیژی شای پەریان سواری ئەسپێك بوون، دووەکەی تریش هەریەکە سواری ئەسپێك بوون لێیاندا ڕۆیشتن.

کیژەکان گۆتیان، کچی شای پەریانت دەوێ، ئێمە بۆ کارەکەری و ناومالی دەبەیت خوا هەڵناگری، چاکەکت کردیە بیکە بە دوو، ئازادمان بکە.

ئەحمەد ئازادی کردن.

بەخۆ بەکیژی شای پەریان کەوتنەڕێ، چوون لەسەر کانیەك دانیشتن، ئەحمەد گەرمای بوو بەدزی جلەکانی شای پەرییانی لەبەر کردەوە، لە پاشکۆی دانا، کیژە گۆتی برسیمە، نوردییە نانێك پەیدا بکە بیخۆن، کوڕە چوونانی بهێنی، کچە پاشکۆی ڕۆنی شمەکەکانی دیتنەوە گوتی دەڕۆم، نامەیەکی نووسی

گوتی خوا هەڵناگری ئەمنت ڕزگار کردیە، نەریی بێمەرجی کرد، من دەچمەوە لای باوکم وەرە لای ئەو بەسەرفیرازی ئەمن لەوی بخوازە، شووت پێدەکەم.
ئەحمەد هاتەوە کچە نەمابوو ئەملاو ئەولای کرد نەیدۆزیەوە، چوو پاشکۆی ڕۆنی، نامەکەی خوێندەوە، لەجێی خۆی ساردبووەوە، ئەوەندە پەست بوو هۆشی لەکەللەدا نەما.
خدری زندە، هێزی خێرخواز، لەوی ئامادەبوو گوتی : ها ئەحمەد چیتە!؟
ئەحمەد توند گرتی بەری نەدا گوتی: مادام ناوم دەزانی دەش زانی چیم بەسەرهاتووە دەردم بۆ دەرمان بکە.
خدری زندە گوتی: دەردی تو بە من تیمار نارکیٚ هەڕووە سەر ئەو چیایە بڵندە، دایکە دێویك لەویٚ هەیە، ئەوەند گەورەیە ئاسمانی لەناو لنگان دیارە، مەمکی ڕاستی هاوێشتیتە سەرشانی چەپی، هی چەپی خستۆتە سەر شانی ڕاستی، لێی نزیك بەوە، چ قسانی لەگەڵ مەکە، ڕاست دەو بەمەمکی وەنیٚ، بەری مەدە، بیمژە هەتا بەڵێنت دەداتیٚ.
دێوە هەرچەندی کرد، ئەحمەد زاری لە مەمکی نەکردەوە، دیوە گوتی خۆت بە قوربانی ئەو کەسەی کە ئەو ڕیٚو شوێنەی بۆداناوی، تازە شیری منت خوارد ناتخەمە بن کەلێنی ددانانم، ئەوە هەفتەکە لەدوای نێچرێکی وەك تۆ تەڕ دەگەڕێم بخوازە، ئەوی لە دڵت بیلیٚ، چ هەبی بۆت جێبەجیٚ بکەم!
هوردوو باریکان ئەحمەد چی بەسەرهات بوو، بۆی گێڕایەوە.
دێوە سیٚ کوڕی هەبوو، سیٚ نامەی بۆ نووسین داییٚ، چووە لای کوڕی یەکەم زۆر ڕێزی لێگرت، بەیانی ناردیە لای برای دووەم ئەویش بەڕێزەوە ناردیە لای برای سێیەم، کە برای سێیەم کاغەزی خوێندەوە، لەسەر چاوای دانا.
ئەم کوڕە قۆنگرەیەکی کردبوو، چڵ پێبلقە بڵند بوو، گۆتیە ژنیٚ هەڕوو شفتیمان بۆ بهێنە، سیٚ جار پێی گۆڕی، دەیگۆت یەکی باشتر بهێنە، ژنە

دەنگی نەکرد، دیوەکە گوتی: من برا گەورەیانم نیشانەی پیری لەمن دیار نییە، براکانیشم پەرپووت بوون، پیاو، مێرد ژنی باشی هەبێ داناکەلێ.
بەیانی پەری هاتنە سەر قۆنگرەکە چل فەردە زێڕیان هێنابوو بە چل فەردە خوێیان ئاڵوگۆڕ کرد، دێوەکە ئەحمەدی لەناو فەردەیەك نا، بردیانە لای شای پەرییان، ویستیان بیکوژن، کچە دیتی چاوی بە ئەحمەد کەوت پێکتر شاد بوونەوە.

## 102- کوڕی خاس، لە ژنی خاس دەبێ.

بەتاکە ماڵە لەسەر حەوت ئەستوندان لەدۆڵە چڕەی هەڵیاندابوو، وڵساتێکی زۆریان بەسەرەوەبوو، کە لێورد دەبوویەوە، سەیرت دەکرد هەر تاکە پیرێژنێکی پڕکارەو بە پەشتە پەشت ڕانە دەوەستا بەتەنیایی دەهاتوو دەچوو، لەدەست خۆی نەبوو چبکا، پێشتر خودا لێخۆشبووەکەی باوکی منداڵان یارمەتی دەدا، خودا بە جوانەمەرگی بۆخۆی بردیەوە، کەلێنێکی ئەوتۆی پەیدا کرد هیچ پڕنەبێتەوە، ئەرکی سەرداڕەکەشی کەوت بووە سەرشانی، خۆ هێشتا ژنیشی بۆ مێرمنداڵەکە، کوڕە گەورەشی نەهێنابوو خلتوخارەکەی دواییان منداڵە ماویەتی خۆ گەورەکەیان دەبووایە یەکدوو ساڵێك بوو ژنی بۆ بهێنایە، بەژیانی خێزانداری شاد بکردایە، بەو نێرینەی بەهارە ناچار بوون لەبەر هەڵنەسووڕانی کار ماڵەکە چۆل بکات، کوڕەکەی بنرێتە ماڵی خاڵوانی بەڵکو کچە قژنێکی خۆیانی پێشکەش بکەن، بەو سەرەساڵەی کوردییە لەوکاتە ناسکەدا ئەوەندە پارەو پوو لەگەڵ خۆی ببات، تا هەموو شتێك بەکجاری ببڕێتەوە، وا دیارە دڵیان نەشکاندووە، دەنا دەبووایە ئیستا بەگەڕابووایەوە.

دەستە دەزكەی ئەوبەری دوورو نزیك سەیریان دەكرد، ئەو تاكە ماڵە لەم چۆلگەیەدا خەلك سەگی هەیە ئەوانە سەگیشیان نییە، هەر پیریژنێك دیار بوو، ئەویش بە ژنان ناچی، وا دەزانیّ دنیا شامی شەریفە، بەڕاستی سەیرە ! باشە هەرنا دەبیّ ناوبانگی ئێمەیان نەبیست بی! خەلك منداڵمان پیّ لە بێشكەدا ژیر دەكەنەوە دەبی ململانەیەكیان لەگەڵ بكەین .

سەر دەستەی دزان: برایان با بچین لەو تاكە ڕەشماڵە میوان بین، برسێتی تەنگی پیّ هەڵچنیوین، پاش تێرخواردن دوور نییە ئەسپی خۆمانیان لەگەڵ لنگ بدەین، دیارە ئەوانە زۆر بێباكن، لەهەموو كەس بێمنەتن.

كۆمەڵەی دزە پیاو خراپەكان فەرموو پێشمان كەوە، هەرچی فەرمایشت بكەی ئێمە جێبەجیّ دەكەین، سەرمان لەپێناوتۆدا خەلاّتە.

هەر كەسە لیّ سواری ولاّغی بوو، چوون لەبەر ئەستوندەی ڕەشماڵی جەلەوی ولاّغیان گرتەوە، سەر دەستەی دزەكان بە فیزو لەخۆبایی بوونەوە، سەلاموعەلیك خاوەن ماڵ، پیریژنیّ مسری گۆشتی ڕەشتاڵەی بچكۆلانەی توند خۆشەتەكدای بە پیریانەوە هات، بەزمانێكی زۆر شیرین بە ڕوویێكی لە گوڵەكانی نەرۆز گەشتر گوتی: یاخوا بەخێربێن سەر هەردوو چاوی من، ماڵەكەتان ئاوادانكردەوە، جەڵەوی ولاّغەكانی گرت، هەر یەكی لەشوێنێك پێبەست كرد، گەڕاوە، گورج دوو مافووری لاكێشەی هێنا ڕایخستن، جاغێك تووتنی هێنا سەرو چەنگی خستە ناو كیسەكانیاوە، بێژن دەهاتوو دەچوو دەتگۆت پەلیكە، هەندی بلّێی یەكودوو، كۆتكێك ماستاوی لەپێش دانان.

پیریژن: لەدەورو گەڕێم، ئەگەر زۆرتان برسییە هەتا نانێكی سەرپێیی و بۆ ئامادە بكەم، ئەگەرنا بەرخێك و بۆ دەكەمە بەربەسێری، بان قوڕاو.

سەرکردەی دزەکان: داپیرە، بەفرنینە لەسەران بورین، کاروانینە ڕادەبرین، هەر سەرپێی خواردنێکی سادەمان بۆ دروست بکە، برسی نەبووینا، ئەم ئەرکەم نەدەخستە ئەستۆی پیرێژنێکی پڕکاری وەك تۆ، دەبی بشمان بووری.
پیرێژن: ڕۆڵە دایکی گورگی بارن دیتە، هەنووکە بە ئارەزووی خۆتان چتان بووی بۆتان ئامادە دەکەم، ڕۆڵە خۆ بەخۆڕایی پارەی دوو ژنانم پێندرایە.
یەك لە دزەکان بە زەردەخەنەوە پارەی دووژنان بە تۆ دراوە؟!
پیریژن: بەڵێ کەسی داپیرەی، بەمن ، هەی لەمن هەی لە ژنەکەی تو؟!
دزەکە:دەبێ ئەو پیاوە چ پیاوێك بێ؟!
پیریـژن: ڕۆڵـە لەسـەرەخۆ بـە، ورد تەماشـاکە، بیربکـەوە، پیریـژن دەسـتوبرد، چـەند هیلکەیـەکی شـکاندەوە نـاو مەقلییەکـە، لەسـەر خوانـچەی دانـا، کوتکـە ماسـتاوێکی تـری بـۆ هێنـان، لاو دوو سـەلکە پـەنیری خستە ئەملاو ئەولا دوو قـاپ لۆریـشی تیزوفیـز لەنێوانیانـدا دانـا، فـەرموون ڕۆڵـە نانەکـەتان بخـۆن، لەکەموکوڕیمان ببورن، خۆتان پەلەتانە.
سەر دەستەی دزەکان: داپیرە، ئەی کوا پیاوەکانتان؟ لەماڵێ نییە.
ژنە : نەخێر من هەموو شتێکم، لە چتان کەمە؟ بلێن.
سەر دەستەی پیاو خراپان، هیچ قسەبوو هات.
پیریژن شتێکی ترو دڵدەگری بۆتان دروست بکەم؟
یەك لە دزەکان: نا خواردن و خواردنەوەی بەهارێیە.
دزەکان تێریان خـوارد، سـەرو جگارەشـیان لـە تـووتنی داپـیرەی داگیرسـاندو بەبادا، سەرو چای شیرینیان بەدواوادا کرد.
سـەرکردەی دزەکـان پـاڵی دابـۆوە قـۆڵی ڕاسـتی خـستبووە سـەر بالیفەکـەی تەکیەوە هاتەقسە گوتی: ئەریٚ داپیرە ئێوە بەتاکە ماڵە لـەم چۆلیانەو هەڵدایـە، بێسەردار چۆن دەژین؟

پیریژن: ڕۆڵە چ هەیە ، ئێمە خراپەمان بۆ کەس نییە؟

سەرکردەی دزەکان: باشە لەم هەردەو دوورە ئاوەدانییە، خەڵك سەگی هەیە، ئێوە سەگیش و نییە، ناترسن دەستە پیاوخراپێك، زۆر دارێك دەست بەسەر ماڵەکەودا بگریت و ببیات.

پیرێژن: کوڕی خۆم ئەوەی ئێمە بناسیٚ، خۆ تووشی تۆڕی مەناکات، دیٚ مێوان دەبی، نانی خۆی دەخوات، ئەگەر پێویست بکات یارمەتیش دەدرێن، تا ئێستا کەس نەیگۆتووە پێتان بەخراپ داناوە، ئەوی ئێمەش نەناسیٚ، ئاشاکی ئێوە، خۆی تووشی سەر ئێشە دەکات پەندو ئامۆژگاری دەکەین، ئەگەر تێگەیشتوو بیٚ ئەوا ڕێی خۆی دەگریٚ، ئەگەر ناخۆی تووشی سەر ئێشە دەکات.

سەرکردەی دزەکان: نمەکمان کردوون، نامەویٚ دەستدرێژیتان بۆ بکەم، پیرێژن قسەکانت ئەوەندە ڕەقن، ئەوەندە بە زەقیت دەربڕین، خۆتان بە زۆر داناو خەڵکت بەکەم دانا لەزگە، ماڵەکەتان خڕ بەتالآن ببەم.

پیرێژن: ڕۆڵە دەمێکە لەبەر دەگێڕی، لە ڕاهی خوات پێدەڵێم بە ڕێی خۆتدا بڕۆ چۆن هاتی؟ ئەوها بگەڕێوە، ئەو ماڵە بەکەس نەخوراوە بە تۆ بخوریٚ، ئەگەر بەکەسێك بخورابووایە، بۆتۆ نەدەما.

سەردەستەی دزان: من سەرکردەی ئەو کۆمەڵە دزەم، بەدرێژایی ژیانم، چاوم لەبەرکەس نەترووکاندووە، ماڵەکەتان بەتالآن دەبەم، بزانم کوڕەکانی تۆ، ئەوەندە شانازییان پێدەکەیت، چ دەکەن؟ چ دەست هەڵینانەك دەکەن.

پیرێژن: ڕۆڵە، هەر کەس سیپارەی خۆی دەخوێنێتەوە، دوور نییە هەریەك لەمن و تۆ لەمەبەستێك لەسووچێکەوە مەبەست بپێکی، پیاو خراپ بەخراپە، پیاوچاك بە چاکە لێکیدەدەنەوە.

سـەر دەسـتەی پیاوخراپـان تـازە هیـچی تێـدا نەمایـەوە، بەسـەردارو جگـەر گۆشەکەت بڵێ چی لەدەست دێت کەمتەرخەمی نەکات.
پیرێژن: ڕۆڵە کوڕەکەی من بەسەد پیاوی هەیە، ئەگەر شێر هەیە کەرکەدەنیش هەیە گوناهی خۆتان ، لەملی خۆتان.
سەردەستەی دزان: پیرێژن، قوڕ بەسەری پیاوەکەت.
پیرێـژن: مـن سـەردارەکەم ماوەیەکـە چـووەتە جیهـانی نەبوونییـەوە، دوو کـڕی لەپاش ماوەتەوە، یـەکیان ئـەو منداڵـەی بـەر مەڕییـە، دووەمیـان گـەورەکـە ئـەوە هەفتەیەکە چوویتە ناو خاڵوانی ژنێکیان لێبخوازی، یـەك هەگبـە پـارەی لەگـەڵ خۆی بردووە، هەموو شتێك دەبڕێنیتەوە، ئێوەش پیـاوی بـاش بـن خراپـەکاری ملشکانی لەدووە، پێمناخۆشـە لاوی وەك ئێوە نـازدار ژێـر چـەپۆکی کوڕەکـەی مـن بـبن، ئەگـەر ئێـوە سـکتان بـەخۆتان ناسـووتێ، بـەماڵ و منداڵـەکانتان بسووتێ، هەونکە هەریەکە کۆزە خێزانێك و هەیە.
سەردەستەی دزان: پیرێژن کارلەکارترزا بادانەوە لەگۆڕی نییە.
پیرێـژن: بـە ئـارەزووی خـۆت بکـە، تـۆ سـەرفیرازی چ دەکـەی بیکـە، ئەگـەر شەرمیشت بەخۆیە من چەند سەر مەڕێکت دەدەمێ، خۆت پێ هەڵبکێشە، بڵـێ بە زۆر هێناومانە.
یەکێك لەدزەکان بە زەردەخەنەوە: داپیرە کوڕەکـەت چووە لـەناو ماڵـە خـاڵوانی ژنێکی وەك تۆ نازدار بخوازی؟!
پیرێژن: بۆ؟ دیارە منت نایەتە بەرچاو؟! ناچووە بـەدوای قەلقەلاشـك کـەوتووە؟ خوا بکەم بە ئاواتی خۆی بگات، سێ مەڕ خێری مەولودی پێغەمبەر سەدەقەی سەری زندیان بی.
سـەرکردەی دزان: بـەلاش لـەختوخوڕایی ئـەو کـوڕەت ناردۆتـە هەنـدەران چـیە ژنێکی وەك تۆ نازدار بخوازی !

پیرێژن: کوڕی من لەسەر هەران ناگەڕێ، کوڕی خاس لەژنی خاس دەبێ، گوجیلەی گورگ خنکێنی لە دێڵە حیزی هەڵناکەوێ، جوانی بەنانی ناخورێ، کوڕە ئەوەتە کوڕ بێ لە ئاشان نۆبەت بڕ بێ.

یەك لە دزەکان: دەك ئەو ئاشەی کوڕەکەی تۆ نۆبەت بڕی لێدەکات کۆربیتەوە.

پیرێژن: من چ لەبەرو ناپارێمەوە، ئێوە فرچكو بەخراپەی گرتووە وا بەئاسانی وازناهێنن.

سەرکردەی دزەکان: ئەو زاکوماکەی تێکەڵ بکەن، بەتالاّن دەیبەم، بزانم کوڕی پیرێژنە ڕەقەی چ دەکات؟ سوورکە پێشکەوە، عەجەلەی لەنێریان بکە.

پیرێژن: ڕۆڵە کتوپڕ بن، خۆ دەخەنە زاری نەهەنگی.

سەردەستەی دزەکان: بیبڕەوە، من تالاّنم برد بزانم کوڕە پووچەکەی تۆ چ دەکات؟

پیرێژن: تا ئێستا لەگوڵێم گرانتر پێنەگوتی، قسەی ناشیرین بە کوڕم بڵێی، وەلاّمتان بە ناشیرینی دەدەمەوە، ئێوە تالاّنی خۆتان برد، ئەگەر کوڕی من تالاّنی گێڕاوە ئێوەی ژێر دەست کرد، دیارە لەهەناوی منە، ئەگەر نا گەردەنی باوکیشو ئازابێ.

سەرکردەی دزان: دەترسم زماندرێژی تۆ مێردەکەتی تووشی لەناوچوونی کردبێ؟!

پیرێژن: ببوورە من بۆ مێردەکەم زۆر باش بووم، هەر بانگی دەکرد خانم، من دەمگوت گیانی خانمێ، لەسەرە مەرگی گوتی، بۆ شاسواری کوڕم، ئەگەر ئەمن مردم ژنێکی لەماڵی باوانت بۆخوازە.

دزەکان کوڕە بچکۆلانەکەی پیرێژنێیان بەر هەڵدا گەڕاوە، وڵساتیان تێکەڵ کرد بردیان، خەریك بوو لەچاو وندەبوون.

ئێواره پێش ڕۆژئاوابوون شاسوار بەخۆ بە بووکی گەیشتە جێ سەیری کرد، باڕە باڕیان لەبەر دەرگانەماوە، بەنهێنی بانگی دایکی کرد، ها دایە ئەوەی چییە؟

دایك هوردو باریکانی بۆ گێڕایەوە.

شاسوار بۆ کام لاچوون.

دایك کوڕم ئەمشەو لای بووکی بمێنەوە.

کوڕە: ئاگات لە بووکی بێ، بووکی تێمەگەینە.

دایك بڕۆ خدری زندەت لەگەڵ، دایك لەسەرت گەڕێ.

شاسوار لێ سواری هەسپی بوو، زرێی پووش، ڕمی خستە ناوەندی هەردوو گوێ هەسپی، شیری عەمایل کرد، مووەکانی لەتاوان وەك نەشتەریان لێهات بوو، هەیپای لێکرد، بەیانی ڕۆژی داونەدا، لە دەشتێکی بەرفراوان تووشی دزان هات.

بانگی کردنێ کوڕینە بەخۆ کەون، دەستهەڵێنن، کوڕی پیرێژنێ گەیشتە سەر گیانتان، وەك بازوشەهێن و چۆلەکە وازیتان پێدەکەم.

شاسوار دووجاران بەسواری ئەسپی هاتووچوو، یەکێکیانی بە سەری ڕمی وەکرد یەك قسەی ناشرینی نەکرد، هەر دەیگۆت دەستهەڵێنن، ڕۆژی تیربازییە، ڕانەوەستا هەتا هەمووی بەر زەفت کردن، یەکێکیان کردە سەرە شوان بە یەکێکی تریان دوا شوان، ئەوانی تر دیل، تا گەیشتەوە بەر دەرگای ڕەشماڵ.

پیرێژن: کتوپڕ بێ، چەندو لێپارامەوە دادی نەدا نەم گوت: کوڕی خاس لە ژنی خاس دەبی .

سەرکردەی دزان: داپیرە لە دوو چووان مەچوو، خوا هەڵناگری هەرتۆ کوڕت هەیە، ئێستاش هەرچاوەڕوانی چاکەین.

پیرێژن: ڕۆڵە با ئەو پیاوانە چیتر شەرمەزار نەبن ئازادیان بکە.
کوڕە: دایە فەرمایشتە ، با بڕۆن.

## 103- کوون بووە و ئا.

هێشتا ئەم جۆرە چەکومەکانە دانە هات بوون، سوارە کە لاوێکی هەبووە بوو، بەهەر چۆنێك بوویێت دەمانچەیەکی قەرەبینای ئەو سەردەمی پەیدا کردبوو. ڕۆژێکی پاش بارانەی بەهار تازە پەلکە ڕەنگینە لەنگەری خست بووە سەر تیلەکەی سەیدەوان، کۆڕی دیوەخان گەرم بوو، باس هاتە سەر دەمانچەی قەرەبینا، پاش چەند شاقاوێك تەنەکە کون ناکات، سوارەش ئەو مام سوارەی ئیستا نەبوو، لەمەدا تووڕەبوو، کەوتە قسەی بێ لێپێچانەوە، کار وای لێهات لەگەڵ خاڵ سمۆ کەوتنە مەرج کردن.
ئەگەر دەمانچەکەی سوارە پاش... شەقاوە، تەنەکەی کون کرد، ئەوە ئەو دڵخوازی بکات، ئەگەر نا ئەو هەرچی لێی بکات سەرفیرازە.
دیوەخان گرمەی دێت، کەسی لاییدەش دانیشتوون، لە لادێشدا هەر هەندە گۆترا، ئەو مووە لەپیاوان نەهاتبێ، سوێندێکەو دەبڕێتەوە.
تەنەکە دانراو سوارەش دڵی کەوتە کوتە کوت، دانیشتوانیش کەوتنە سەیرکردنی ئەو گرەوە بەچی دەگات.
بەڵێ سوارە نیشانەی گرت، پەنجەی داگرت، تەققەی لێوەهێنا، تەنەکە وەرگەرا، غاریاندا چوون، تەنەکە تەنیا قۆپابوو، سوارە بێدیتن هەر دەیگۆت: کون بووەو ئا، خاڵ سمۆش بۆ بەزم وازی پێکردن تەنەکەی پڕ ئاوکرد، وتی خزمینە ئاوی لێدەچێت؟!
دانیشتووی کۆڕەکە کەوتنە قاقای پێکەنین و گاڵتەکردن.

یەکێك لە پاشان لەمام سوارەی پرسی: ئەرێ بۆ لە قسەکەی خۆت نەدەهاتیە خواری، خۆ دەشتزانی کون نەبووە.
گوتی: پیاو ئەو پیاوەیە، قسەیەك ، ئیشێکی کرد لەقسەکەی خۆی نێتەخواری، پیلەکەو ملەی لەسەر بکات.
دیارە ئەمڕۆش سوارە زۆرن، شوێنەوار کوێر نییە.

## 104- کوندێرە، بەشەو ماندی ، بە ڕۆژ شێرە.

کوندێرە باڵندەیەکی ڕەشبەلەکە، لەخۆشناوەتی زۆرە، زۆر چاپووك و ئازایە، شتی سەیری لێدەگێڕنەوە، بەڕۆژ تا ئێوارە داری کوندەکات، نرکەی لێوە دێت، بەشەو کفت دەبێت دەڵێت: جارێکی تر توخنی کاری واناکەم، بەیانی زوو لەگەڵ گزنگی خۆرە تاوا لەجاران ئازاتر ئەو خووە سروشتییە دووبارە دەکاتەوە.

* ئەم پەندە بۆ تۆبەنەکردن بەکاردێت، بۆ وازهێنان لەخورپەی سروشتی.

## 105- کێروشکی قشقەیە، بی هاتە هات ناتوانێ.

قەشقە گوندێکە لەسەر زێی پردێیە، لایەکی زوورگە، کێروشکی زۆرە، ڕاوچی بۆ ڕاوێ ڕووی تێدەکەن.
کێروشکەکان شارەزابووینە، لەنەرمانی ڕاوچی دیاردی لەتاژی دەکەن کەروێشکەکان ملی چەقێنو هەرەتی دەگرن، گەیشتنە سووگەو نەواڵان ناگیرێن. کەروێشکەکان پاش هاتە هات دەگەڕێنەوە نەرمانی، دیسان

ڕاوکەرەکان ڕستیان بەردەدەنێ لە دوویان دەبێتەوە هاتە هاتو بگرەو بەردە،،
جاریشوایە بەگیان زیانی لێدەبینن.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن، خۆی بێهەرا نەتوانێ.

## 106- گۆلکی قوشتەپەیە، بەیەك ساری دەوی دەگاتە ئاخوڕی، بەدوو ساری دەوی ناگاتێ.

وەرزێرێکی قوشتەپەی، چێڵەکەی دەزێ، گۆلکێکی دەبێ، دەینێ، پاش چەنداوێك گۆلك بەلەوەڕ دەکەوێ، ئاخوڕێکی بۆ دەکات، لە ئاخوڕی بەجوانی دەلەوەڕێ، ساڵی دووەم گۆلك دەبنسێ هیشکەبێتەوە، دەمی ناگاتە ئاخوڕی، ئاخوڕەکەی بۆ خرا دەکەن نەوی تری دەکەن، ئینجا دەمی دەگاتێ، لەو سەردەمەوە بووە بە پەند: گۆلکی قوشتەپەیە....... .

* ئەم پەندە بەشتێك دەگۆترێت لەجیاتی زیاد بکات، کەم دەکات.

## 107- گوند گوندی خۆمە لە ترسی سەیان ناوێرم بچمەوە.

کابرایەکی دەڤەری هەرەتی کۆیێ، کاربەدەستانی میری ئەو ناوچەیە دەریانپەڕاندوو هات بووە هەولێر بە تۆبزی دەشیان گۆت دەبی بگەڕێتەوە، لێیان دەپرسی ئەتوو خاوەن گوندی بۆ ناچیتەوە؟ وا دەڵێن بێتەوە.
کابرای دەستوو پێ سپی دەیگۆت: گوند گوندی خۆمە...... . دەیزانی بچتەوە دەیکوژن.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن خاوەنی ڕەوای شتێك بێت لە ترسان بەجێی بهێڵێت.

## 108- لە بن کەپرێ سەپانان، دەبا خەپلێ وەت لێبێ.

خەپلێ کچێکی بوو گۆشتی دەخورا، هەر بە گێلۆ کەیی دەبردە سەر، کەلکی لە پەندو ئامۆژگاری ئەمو ئەو وەرنەدەگرت، هەروەکی تەمەنی منداڵی ئەو پەرێزو ئەو پەرێزی بەدوای وشی کردن دەکرد، کاتو ناکات لەلای ئەو نەبوو، تا کێشتانێك لەژێر سێبەرۆکەی پەرێزێکی نەدیو، تووشی جاعیرێکی ملهووڕ بوو، پێش ئەوەی گیشەکەربێ، ئەوی پێی دەکەن، دەکەن، پاشان ئاشکرا دەبێت لەوکاتەوە بووە بە پەند دەڵێن: لە بن کەپرێ سەپانان ، دە با خەپلێ وەت لێبێ.

ئەم گۆتەیە بەکەسێك دەڵێن، بەپێی تەمەنی خۆی هەڵسو کەوت نەکات، گوێش لەم و لەو ڕانەگرێت، ئەنجامی بەخراپە بێت.

## 109- لەخۆشی مێوانان ، خەومان نایێ.

ماڵێکی هەژار ، کۆمەڵە مێوانێکیان دەبێت، شەو نوێن نامینێ بەخۆدا بدەن، لەبەر قۆرتی ئاگری، دادەنیشن، قسەی خۆش خۆش دەکەن.

مێوانەکان دەڵێن، بەو درنگە بۆ ناووون؟!

دەڵێن: لەخۆشی مێوانان خەومان نایێ.

* ئەو پەندە بەکەسێك دەڵێن بیەوێت سەرپۆشی کارێکی پێبکات.

## 110- لەدەرێ ڕابی ، لە ژورێ ڕۆمی، هاوارم بەبەر تو ڕەبی.

کابرایەکی لادێیی چەند جەندرمەیەك میوانی دەبن، تاکە مریشکێکیان دەبێت، جەندرمە دەڵێن دەبێ ئەو مریشکە بکوژیتەوە.

ژنەی خاوەنماڵ دەغەزری، دەڵێ ئەو سەرە بەو قەلبەی وەنابی، نابی مریشکی جاقی بکوژییەوە.

کابرا هەر چەند لەبەر ڕابی خێزانی دەپاڕێتەوە داد نادات، جەندرمەش لە ژوریَ دانیشت بوون، دەیانگوت دەبی بیکوژیتەوە.
کابرا دەڵێت: لەدەریَ ڕابی، لە ژوریَ ڕۆمی...... .
* ئەم پەندە بەکەسانێکی بێدەسەلاَت دەگوٚترێت لەنێوان دووهێزدا هیچی پیَ نەکرێت.

## 111- لە سارانە لەمانگانە ، مارمیلۆق بە دووانە.

جاران پیاوێك هەبووە بووایە، باچی لەبار دانە بووایە، کەم وادەبوو، دەستی لەبەر دەستی هەڵبدرایە، لە میرە دێیەك، پیرەمێردێکی ڕەقەی مەندموور هەبوو، سەردەمی لەباری، دوو ژنی نازداری ناسکی مزوریان ئاسایی هێنابوو، ڕۆژگار ڕۆژ بە ڕۆژ لێوەشانەوەی لەقتر دەکرد.
ژنێکیان ڕووخۆش و تەوقەبوو، گەلێك جار هاوڕێکانی لێیان دەپرسی: ئەریَ ئێوەو سەردارتان، چەند بە چەندی؟
ژنەکە بە زەردەخەنەوە دەیوت: لە سارانە لە مانگانە ، مارمیلۆق بە دووانە.

## 112- لەشیرنە خەوی سبەینانو دۆی مارە جیرانان بووم.

یەکێك لەو نەریتە باوو جوانانەی لە باوكو باپیرانەوە بۆمان ماوەتەوە، بارو بووی هەژارانە، ئەوەش بۆ ئەوە کراوە، تا هەژاران دەستە وەستان نەکەون، پەکیان بکەوێت، بێزاری لە بوونو ژیانی خۆیان بکەن.

یەکێك لەو بارو بووەی هەژاران، مەڕە بەدۆی بەهاران بوو، خاوەن وڵسات دەرە بەهاران، ئەو دۆستو ناسیاوانەی ئاو خۆرەوەی ئاوایی، مەڕە بە دۆیان نەبووایە سەرو مەڕە بە دۆیان دەدانێ، کە مەڕ وشکی دەکرد، مەڕەکانیان بۆ خاوەنەکانیان دەناردەوە، بێچووەکانیان دەگێڕایەوە لەگەڵ خورییەکانیان، بێجگە لەدۆو بۆیەکە. دەڵێن ژنێکی تەوەزلی کارنەکەر هەبوو، پێشتر سبەینان تا کێشتان دەنووست، کێشتان لەخەو ڕاست دەبووە دەچوو لەماڵە مەڕدارێك دۆدانێك دۆی دەهێنا تێری دەخوارد، ساڵی دووەم مەڕە بەدۆیان دایێ، کەوتە پەشتە پەشتی مەڕان دەیگۆت: لە شیرنە خەوی سبەینان و دۆی مارە جیرانان بووم.

## 113- لەوەعدی گیاگۆڕان، سازم لێدەدا لۆ جوامێران.

مێرووولە بووە بەسەر بەندو دوابەندی گۆتەو سەر گوزشتەی چیرۆکی چیرۆکبێژانی کوردی. مێرووولە لە بەهارێڕا تا سەرماو سۆڵەی زستان بێوچان، سەر لەبەر کار دەکات، بۆ کاتی مەترسی، بۆ تەنگاوی زستانی بێدەرامەتی. زستان هات، کارو پیشە نامینێت، پێشوولە تەنگاو دەبی، جێنامینێ لێبژی... بخوات...، چارەی نامینی دەست بە ڕووی خۆی وەدەنێ دەچتە ماڵی مێرووولەی داوای یارمەتی لێدەکات.

مێرووولە دەپرسێ : ئەرێ کاتی گیاوگۆڵو گەرم و خۆشی چیت دەکر؟!

پێشوولە: وەعدی گیاو گۆران، سازم لێدەدا لە بۆ گەوران، جوامێران.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن دەرفەت لە دەست خۆی بدات، بەکارێکی بێسوود خۆی خەریك بکات، شەرمەزاری ئەمو ئەوی کار کەربێت.

## 114- لەكو کوردو ئۆرمزیار، بە نەعلەت بن هەزار جار، لەگەڵ دەلۆی خەتاکار.

وەیسی قەرەنی پیاوێکی دەوڵەمەند و بەناوبانگ بوو، هەتا بە ئەسپی ڕادەگات، ناڵی پێی کەرێی زێڕ بوو، ئەم پیاوە ناودارەی کورد، پیاوی کۆڕو

دیوەخانان، هەر شوێنێ ئەوی لێنەبووایە، لایەکی بەتاڵ بوو، شوێنی دیار بوو.
قسەکانی دەبوون بە پەندو گۆتەی کوردی، خەلك بۆ یەکتریان دەگێڕانەوە، تا قاڵبی خۆی دەگرت، لەو پیاوانەش نەبوو کەس دەستی بۆ درێژبکات، خۆ بە ئاشکرایی هەر هیچ، بە دزیش ئەو پیاوە نەبوو دزی لێبکرێ.
هەرچەنداوێکی سەردەم سەردەمی دزیکردن بوو، خەڵك هیمایان بۆ یەکتر دەکرد، دەستە دزێك پێکهات بوون لە: لەكو کوردو ئۆرمزیار، دەلۆش دەست کیسی دەکات، دەچن ناڵی پێی کەری وەیسی قەرەنی بدزن، چەندی دەکەن پێیان لێناکرێتەوە ناچار هەردوو پێی کەرەکە بەمشاری دەبڕنەوە، پێیەکان دەبەنەوە ماڵی، ناڵەکانیان لێدەکەنەوە.
مانگێكو دووان دەنگوباس بە وەیسی قەرەنی دەگاتەوە، دەڵێت: لەكو کوردو....... .

* ئەم پەندە بە کەسێکی خەتاکار دەگۆترێت وەیا چەند کەسێکی تاوانبار.

## 115- لە کورتانی خۆی دەخوا، دەلەوەڕێ.

گۆتەیەکە دەگۆترێ بۆ پاراستنی گیانی کەرێ کورتان دروست دەکرێ، سایە جلیش هەیە، جلو سایە جل، وەکی لەکەلك کەوتن، پارچە دڕاوەکان

دەبڕن، پینەی دەکەنەوە ڕێکی دەێخن، دژ بە گرەماو سەرماو سۆڵە لەسەر پشتیان دەبەستن تا هەتاو گازو سەرما گەستی نەبن.

کورتان بەشێوەیەکی تایبەت دروست دەکرێ بۆ پاراستنی پشتی کەرێ، لەباری گران، کەر دەبەستریتەوە، لەبیر دەکەرێ، دەگەوزی، کورتانی لێدەکەوێ، برسی دەبێ، سەری پووشی ناو کورتانەکە دەدرێ، پووشکە بەزانایی دەردەهێنێ دەیخوات، ئەو کورتانەی گیانی دەپارێزێ، چارچییە؟ برسێتی ناچاری دەکات بیخوات.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن لەناچاری لەمایەی بخوات، ئەو دەستمایەی ژیانی پێوە بەندە.

## 116- لەکێ شکایە ؟ لەکێ دەنگ دە داتەوە؟

یەکێك دەستی بشکێت، بەهەڵەداوان دەیبەنە لای بەیتارێکی شارەزا، گەرماو گەرم دەستی دەگرنەوە، نەوەکو خوێن و گۆشتپارەی بهێنتەوە. دوو سێ کەس دەورەی لێدەدەن، یارمەتی بەیتار دەدەن، یەك دەستە شکاوەکەی ڕادەکێشێ تا خوار نەگیرێتەوە. دەست شکاوێك زۆر هیلاك دەبێ، دەمارەکانی شل دەبێتەوە بایەکی لێبەر دەبێ.

بەیتارەکە دەڵێت: لەکێ شکاوە ، لەکێ دەنگ دە داتەوە !

## 117- لۆ ترِی ؟ لە عەژمەتێ تتن.

کابرایەکی ... ئەو قەراجە ترەکی دەکات، لەناوەوانیش شوورەییەکی زۆر گەورەیە، برادەرێکی لێی دەپرسێت ئەوە بۆ؟ دەڵێت لەعەژمەتی تتن .

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن ، هەنجەتی شتێك بە شتێکی تر بگرێت.

## 118– لۆت بمرم ، بەرمە برنجەکەی شارەزور – ئۆخەی – 0

کچە گاوانێکی شارەزووری زۆر قەشەنگ و جوان، قوتە کێخوایەکی ئەو دەشتی هەولێرە، داخوازی دەکات، پاش چەنداوێك دەیگوازێتەوە، مانگێك و دووان کیژ هەڵدەستێ، دادەنیشێ دەڵێت: لۆت بمرم بەرمە برنجەکەی شارەزوور.

ئارامی لە مێردە هەڵدەگرێت، مێردە سەری سوور دەمینێ، دەبی ئەو بەرمە برنجە چی بێت ئەوەندە لای خێزانەکەی وی خۆش و دڵگیرە.

ڕۆژێك لەدیوەخان دەگەڕێتەوە خۆی لێ دەگرێت دەبینێت وا ژنە لەهەر تاخچەو دەلاقەیەك نانێکی داناوە یەك یەك دەگەڕێ دەڵێت ماڵی نانی گاوانی... نانەکان دەچنیتەوە.

دوو ماینان زین و لغاو دەکات سواری دەکات بەرەو شارەزوور ناوی خوای لێدەینی دەڕۆن دەگەنە هەرێمی شارەزوور، ژنە چاوی بەجێ جۆخینەکی برنجی دەکەوێت خۆ فڕێ دەداتە خوارەوە، هەندێکی لێ بەبا دەکات، یەك دوو دنکە برنج دەمینێتەوە داوێتە زاری دەڵێت: ئۆخەی بەرمە برنجەکەی شارەزوور.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن چاوی لەدوای شوێنی خۆی بێت، شوێنی لێگەورە بوونی.

## 119– لۆ من هەر بە ڕبەی قەرە تەپەیە – تەقتەق.

کابرایەکی نەبووی، هەژاری تووشی کەس نەبی، لەسەر ڕێوشێنی پێغەمبەر دەرگای حەوشەو ماڵی گۆڕی دادی نەدا، سوودی نەبوو، ناچار بار دەکات دەچێتە شوێنی دوور بەڵکو خوا دەورێکی لێدەکاتەوە.
چەند مانگێك ماڵداری کرد، سەرە ساڵ داهات، شەوێ خەونی دیت، لەوخەونەی دەرامەت بەسەر میللەتەکە دابەشدەکرا، هەر یەکە بەجۆرە ڕبەیەك بۆیان دەپیوا، نۆرە گەیشتە سەرکابرا دەڵێن: ڕبەی قەرە تەپە بێنن، ڕبەو بەشەکەی جاران.
بەیانی کابرا بار دەکات دەگەڕێتەوە بۆ قەرە تەپە.
لێی دەپرسن : ها خێرە؟
دەڵێت : بۆ من هەر بە ڕبەی قەرە تەپەی بوو.
* ئەم پەندە بۆ نەگۆڕی بەکاردێت.

## 120- ماچی سولتانە ، چوو لە قوونی مەرجانە

کابرایەکی مارمژ هەبوو، ئەوی مارو دووپشك پێوەی بدابووایە، دەیانبردە لای ئەو شوێنەکەی دەمژت، ژەهرەکەی فرێدەدا ، مار پێوە دراوەکە ژانەکەی دەشکا، ڕۆژێك، کیژێکی شۆخ‌وشەنگ تا بڵێی جوان مار بەسەری ڕاستی کوڵمە جوانەکەی وەدەدا کچ چ کچ! نەبکەی نەبخۆی هەر تەماشای سای گەردەنی بکەی، پیرەمێردی مارمژ بانگ دەکەن، دەم بە ڕوومەتی سولتانەی وەدەنی، دەمەك‌و دووان زۆر خۆی پێوە ماندوو دەکات، کچە چاکەبیتەوە.
ئێوارەیەك پیرێژنێکی زۆر پیس‌و پۆخلی گوندی، مەرجانە ناوێك دووپشك بیلامانی بەدەرکی قینگی وەدەدات، پیریژن بۆن گرمخای لێدەهات. لەدوای مارمژ دەنێرن، دەڵێت نامژم، هەرچەندی دەکەن‌و دەکەن، دەڵێ نامژم، یەکدوو

لاوی ملهوڕ ئەملاو ئەو لای لێدەگرن، چارەی نامینێ دەم بە قینگی پیرێژن وەدەنێ بڕێکی دەمژی.
لاوێکی مەفتووق پاشان دەڵێت: مارمژ حالت چۆنە؟
مارمژ دەڵێت: ماچی سوولتانە چوو لە قوونی مەرجانە.
* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن لەکارەکەی چاك و خراپ سەروبەر دەربچێت.

## 121- ماری بووبەی – نانیان نەبوو، تەڕە پیازیان دەچاند!

بووبە، تاقە کوڕێکی هەبوو، هات بمرێت بانگی کوڕەکەی خۆی کرد گوتی: ڕۆڵە ئەگەر ئەمن مردم، فلانە کەس برادەرمە، بۆ پرس و ڕا هەروە لای ئەو، کابرا چووە جیهانی ون بوون، کوڕە مایەوە،ساڵەکە قاتووقووتی بوو، چووە لای کابرا گۆتی مام... باوکم بۆ پرس و ڕا تۆی بۆ دەست نیشان کردووم.
کابرا گوتی: ئەم ساڵ نەهاتە دەغلودان زۆر کەمە دوو دابەستیان دابەستە، کۆزت ساوایە، هەر با قاورمەی بخۆن، بەنانی هیشکی منداڵ تێر ناخوات باراشت لەبەر دەبڕێ، گەیشتنەوە ساڵی نوێ، هاوین، کوڕەکەی بووبەی سەروبەر دەرچوو، پایزێ کوڕە لاڤ لێدا، بەسەری لموزی گوتی : ئەرێ فلانە ئەمساڵ چ بکەم ؟
لالۆ گوتی: بڕۆ تەڕە پیازی بچینە. پایز چوو، زستان هات لە ئاخە لێوەی، باراشی لەبەر بڕا لەم ڕۆژەوە بوو بە پەند دەڵێن: ماری بووبەی..... .

## 122- ماری تو دیٚ له غەراج.

سالێك دوو خوێ فرۆشی قەراجێ دێنە پرینگەی مولکیە، لەوێ لەگەڵ شوانکارەیەك لێیان دەبێت بە قڕە، دوو خوێ فرۆشەکەی باش دەپەستنەوە، یەکێکیان دەڵێت: ماری تو دێ... بەهار بۆ مەڕ لەوەڕێن شوانکارە دەچێتە قەراجێ، کابرای خوێ فرۆش ناینناسیتەوە لە ناڕەوەستی خۆی دەڵێت: ئەرێ ئەتۆ نەبووی وەکی لە پرینگەی..... .

کابرای کۆڵدار دەڵێت: ئی وەڵڵا هاوار دەکات، چەند هاو توخمی هەیە کۆیان دەکاتەوە کابرای مارکوژ دەکەن، لە چاکەی خۆیان نایکوژن، چەند ڕۆژێك لە پیستی دەگرن.

* ئەم پەندە بۆ پیاوی زمان نا ڕەوەست بەکار دێت، ئەنجامی خراپی بەسەر بێت.

## 123- ماری ڕەش ، لۆی دەڕشێتەوە.

ماری ڕەش هەیە کەم پێوە دەدات، ماران دەخوات ، زۆر نابەزیت، ئەوانەی شارەزان نایان کوژن.

دەڵێن ماری ڕەش گەلێك جار خواردن دەخوات و دەڕشێتەوە، بۆ گوڵ بوون باشە، چیرۆکی برایمی مەلا زێندینان و میر یەحیا بەگ یەکێکە لەم ڕووداوە.

* ئەم پەندە بۆ کەسێك دەگۆترێت هیچی نەبێت، سکی پێبسووتێت.

## 124- مامەسێنە، بەڕەکم دیٚ بە قەردێنە، لچکی بگرە ڕایتەقێنە.

کابرایەکی چاوچنۆك و پیسۆی لەخوانەترس، ئارەزوی بردنی بەڕێکی دەبی لەماڵی خوا، مزگەوت بیبات، بەناوی وامەوە لەگەڵ خۆیدا دەکەوێتە ئاخاوتن دەڵێت مامەسێنە، بەڕەکم دیٚ بە قەردێنە... .

## 125- مەڕ بەپێی خۆی بزن بەپێی خۆی (بەداریٚ وە دەکریٚ).

هەر گۆتەیە، دەڵـێن: بالوولی برای هاروونە ڕەشیدی ، هەردەم پەست بوو، دەگریا، ڕۆژێك هاروونە ڕەشید گوتی: هەرکی دەنگوباسی پێکەنینی بالوولم بۆ بهێنیٚ چی داوا بکات بۆی جێبەجیٚ دەکەم.

ڕۆژێـك بالوول بەناو سەربڕاندا ڕۆیـشت پێکـەنی، کابرایـەك دیـتی چـووە لای خەلیفە هاروونە ڕەشیدی گوتی: گەورەم لە فلان شوێن بالوولم دیت پـیٚ دەکەنی، هاروون دەست بەجیٚ لەدوای بالوولی نارد، پێی گوت ڕاستە تۆ لە فلان شوێن ئەمڕۆ پێکەنیوی؟

بالوول گوتی: بەڵیٚ ڕاستە.

هاروون گوتی: بالوول بە چی پێکەنی؟

بالوول گـوتی: مـن تـا ئـەمڕۆ وام دەزانـی بـە ئاگری تـۆ دەسـووتێم لـەناو قەسابان دیتم مەڕ بە پێی خۆی بەداریٚ وەکرابوو، بزن بە... . دڵنیام بە گوناهو تاوانی تـۆ ناسووتێم.

* واتـە هـەر کەسـێك بـەپێی خراپـەی خـۆی ڕەفتـاری لەگـەڵ دەکـریٚ، کـەس لەجیاتی کەس تاوان هەڵناگرێت.

## 126- مەرحووم چی فەرموو؟

کابرایەکی لادێیی سەگێکی هەبوو، زۆری خۆشدەویست، پاش ساڵێك سەگەکە تۆپی. کابرا لێیدا چووە لای مەلای ئاوایی گوتی: وەرە تەلقینی سەگەبازیم بۆ بدە.

مەلا گوتی: برای خۆم، ئەو قسەیەی مەکە، کوفرە، سەگی ئاوەگر چییە؟ تەلقین بدریٚ!

کابرا: مامۆستا سەگەکە وەسیەتی کردووە، بەشێك پارەشی بۆ تۆ داناوە.

مامۆستا سەری هێنا بنا گوێی کابرا: مەرحووم چیتری نەفەرموو؟!

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن بۆ بەرژەوەندێکی کەم لە ڕێگای ڕاستی لابدات.

## 127– مەقسەد لە قوسە.

دوو کەسی ئەو دەشتی قەراجە دێن بۆ مەخموور، یەکێکیان دەکەوێتە ئاخاوتن، سەر بردە گێڕانەوە، کەلێنی ئەو یدی نادات قسە بکات، دەگەنە مەخموور گێڕەوە دەڵێت: مەقسەد لەقوسە.

کابرای هاوڕێی دەڵێت، ئەگەر قسەکە بووایە چەندی دەخایاند !

* ئەم پەندە بەکەسێکی چیرۆکە درێژ دەڵێن ، ماوەی کەسانی نەدات بدوێن.

## 128– مەکری ژنان ، چیای دەڕووخێنێ.

کابرایەکی دەشتەکی ژنێکی هێنابوو، ژنەکەی لەدەوری دەگەڕا، خزمەتی دەکرد، مێرد وای بە بیرداهات ژنەکەی گۆلکی هەبێت، کار گەیشتە ئەو ئەنجامنە لێك ڕاستهاتن.

ژنە گوتی: پیاوەکە ئێمە هەروا بەختمان ڕەشە، با کەس تێماننەگات بەیانی دەچینە سەر چاکی تەوسکەی، لادێی هەر چەند ژیرو هۆشمەند بن تا ئێستاش بڕوایان بەچاك پیران هەیە.

ژنە زانی بەیانیمێردەکەی لەگەڵ دێت، ترسا لەوێ سوێندەکەی لێبەکەوی، بۆیە دەنگوباسی بۆ دۆستەکەی نارد، بەیانی دوابەدوای مێردو ژنە دوورو نزیك بچێت، لەکوێ خۆی بەرداوە بگاتە لایان.

ژنە دەرپێیەکی دڕا دڕای لە پێ کرد، نزیك تەوسکە، خۆی لەخۆ برد، کەوتەخوارەوە دۆستەکە خۆی گەیاندنێ ئەوە چ بوو؟ ژنە ناشرین کەوت بوو، بلامانێ لەشی دیار بوو، ماوەیەك خۆی هێناوە سەرخۆ، دۆستە ڕۆیی.

ژنە: مێردەکە من لەماڵەوە نەپڕژامی دەرپێیەکەم پینە بکەم، خۆ ئەو کابرایە نەهاتە سەرم؟

مێردە: بەڵێ هات، من لەبەر تۆ ئاگام لەخۆ نەما، کابرا شتی بەسەر دادای!
حورمێ ئەوە بە شوورەیی ناچێت، ڕۆیشتن تا گەیشتنە سەرچاکی.
ژنە گوتی: پیاوەکە دەنا بەو چاکی تەوسکەی لەوەتی خۆم ناسیوە، ئەوی نیرەوزە لەتوو لەو پیاوەی زیاتر کە سی دی... منیان نەدیوە، ئەوەندە شت لەسەرچاکو پیران گپڕام.
مێردە باوەڕی هات، ژنە دڵخۆش بووەوە، تەوسکە لاشاخێکی ڕووخاند، چونکە سوێندەکە فێڵ بوو.
* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن بەهیچ جۆر لە فڕوفێڵی دەرباز نەبی.

## 129–مەلا قوونە، مەلا شەرتی چوونە.

مەلایەکی دڵتەڕ شەیدا ئافرەتێکی ناسكو جوان ببوو، مەلا بەدوایدا دەگەڕا ڕۆژێك و دووان، ژنە دڵی نەرم بوو، ئارەزووی مەلا کپ بکاتەوە، مەلاخەنی بوو لە ژوورێکی چۆڵ، حوجرەی مەلا بەیەکتر گەیشتن، ژنە گوتی مەلا ئەوە شوێنی مەبەست نییە، مەلا وەڵامی دایەوە مەرج چوونە ژوورەوەیە.

## 130– مڕ میاو سەت جار مڕمیاو

دەڵێن جاران لەم کوردەوارییە نەریتی باو ئەوەبوو، کچ کاتی بە مێردانی بهاتایە دەچوو سەری لە دەلاقەی دیوەخانێ دەنا، دەیگوت، مڕمیاو، جوامێرەکان دەیان گۆت بابە ماڵی پێ بەڕێوە دەچێت، خەمێکیان لێدەخوارد.
کیژێك دەیکاتە ملهوڕی لەنەریت دەردەچێت، ساڵێك و دووان کچە دەمینێتەوە، دەستە خوشکانی بەماڵو مێردی خۆ شاد دەبن، باوش بە منداڵ.

کیژە ئارامی لێدەبڕێت، دەچێت دەڵێت مڕمیاو سەت جار مڕمیاو، ئینجا بە شووی دەدەن .

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن لە نەریتێك ، کارێك سەرپێچی بکات، دوایی پەشیمان ببێتەوە.

## 131- میکاییل یەختیار بوو، مندارەکانی نازانن ئاو بگرنەوە.

بەهارێك باران خەڵکی لەخۆ بێزار کردبوو، هەموو دانی ئێواران گەوارەیەکی سەر ڕەشی بن تاری دەهێنا، دەڤەرەکەی بەژێر ئاو دەیێخست.

دەپرسن دەڵێن ئەوە چییە؟

یەکێك ڕاست دەبیتەوە دەڵێت مکاییل یەختیار بووە... .

* ئەم گۆتەیە بەکەسێك دەڵێن زیرەکییەك بنوێنێ لەتوانای ئەو دا نەبێت، مەبەست نەپێکێت، بەڵام لێوەشانەوە هەبێت.

## 132- نەبی قەشان ، کوتکی وەشان، لە شەشان، شەشەی پەڕان، حەفتەی دۆڕان.

نەبی قەشان کابرایەکی ئازاو بەدەستو بردبووە، ڕۆژێك لەگەڵ حەوت کەسان بە شەڕ دێت، شەشیان کەلوکولم دەکات، حەوتەم کەس (نەبی) بەرزەفت دەکات.  ئەم پەندەی بۆ گۆتراوە: نەبی قەشان، کوتکی وەشان... .

* واتە پیاو هەر چەند بەتوانا بێت، لەویش بەتوانا تر هەیە، وەیا ناتوانێ دەروەستی کۆمەڵێك بێت!

## 133- نەپێراوی تەنگ، نەخانەی بە جەنگ، نە مەلای بێدەنگ.

ڕۆژێك مامۆستایەکی گردەی مێزەر سپی دڵتەڕ، دەچێتە لای دوکاندارێك، جووتە پێڵاوێك بۆ خۆی بکڕێ، ئەمەنا ئەوە، دوکانەی پێسەراو بن دەکات، تا دڵی جووتێك ئێمەنی سوور دەگرێت قیڕ سپی دەبێت.

دوکاندارەکە تۆ کۆڵەگەی ئاینی، قازانجت لێناکەم، مایەکەم بدەرەوە، ڕۆژی دووەم مەلا دێتەوە، پێڵاوی بەسەر دادەداتەوە، دادەنیشی، چ قسان ناکات، دوکاندار هەردەی دوێنێ، مامۆستا لە کورتی دەیبڕێتەوە، دوکاندارەکە دەڵێت: نە پێراوی تەنگ، نەخانەی... .

## 134- نە ئاشەوان لە کوڕی خۆی خۆشەبی، نەمار غەرەزی کلکی خۆی لە بیرە چیٚ- گاوان-.

دەڵێن ئاشەوانێك تاقە کوڕێکی دەبێت لە گەرە خۆی دەیبردە ئاشی، ڕۆژێك ئاشەوانەکە ئاگای لەخۆ نابێت کوڕەکەی زیڕەی لیٚ هەڵدەستێت، یەك ڕکێب غاردەداتە لای دەبینیت نەڕە مارێکی نەفرەجا پێی وەداوە، چاوی بەو دەکەوێت ڕا دەکات، کابرای جەرگ سووتاو لێی ناگەڕێتەوە، مارە خۆ لە کونی دەکوتیت، کلکی دەمینێت، ئاشەوان کلکی لە بندا قووت دەکات.

ئاشەوان بۆ تۆڵە ساندنەوە هەر لە سایەی مارەکەبوو، ماریش لەغەرەزی کلکی لە دەرفەت دەگەڕا، پێی وەبدات، هەیە دەڵێت گاوان بووە، هیچ لەمەبەست ناگۆڕێت.

* ئەم پەندە بە دوو کەس دەڵێن، لەدەرفەت بگەڕێن تۆڵەی خۆیان بکەنەوە.

### 135- نووشتەی لۆ ڕۆژی دەکا.

جاران زبارە لە لادێدا باوبوو، بووبووە نەریت دەستووری بۆ داندرابوو، لەسادەیی جوتیارێکی دەشتی هەولێر دەچێتە لای مەلای ئاوایی، سەرقەلەمانەی دەداتێ دەڵێ مامۆستا نووشتەکم بۆ بکە خوا ڕۆژێ درێژ بکات، چونکە بەیانی زبارەم بۆ دێت، وەرزێر دەگەڕێتەوە لەگەڵ پاڵەو تێلەکێشەکان زۆر خۆ ماندوو دەکات، بەدزی ئاماژە بۆ ڕۆژی دەکات، زوو ئاوا بێ.

* ئەم پەندە بۆ کەسێك بەکاردێت ساویلکە بیت، وا بزانی کاری لەنە گۆڕیك دەکات.

### 136- وەکی گاوانی بەربیانێ دەکا.

بەربیان گوندێکە لە ژێر بانەمانێ، گاوانی گوندی بەربیانێ بێوە مێرد بوو، ئارەزوو هۆش و کەللەی بردبوو، لەو هەموو ماکەرو چێڵ و....نەی دەوێرا توخنی هیچیان بکەوێ نەکو بزانرێ، خۆ ماکەرێکی بۆرکۆکەی هەبوو، بۆ کاتی پێویست دڵی بچووبایەو نەچووبایە، چارەی نەما بای دەداوە سەر ماکەرێ گۆڕین.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن، دڵ بگێڕیت و هیچی لەدەست نێت باداتەوە سەرکەونە کوندەی خۆی.

## 137- هـان يمـانى ، پـەردەم هـەر بەسـت لـەكتانى ، بـووك ئەوەتـە، زاواكانى؟

لـەو هـەرەتى بـن چيا هيـشك‌و بريـشكەى بلّباسـان- قەرەچـووغ-، بێوەژنێك كـچێكى نـازدارى بـەدڵو داوى بـۆ كـوڕە تاقانەكـەى خواسـت، خـزم‌و كەسـانى كچە، ڕاسپێرێكيان نارده لاى كوڕه دەستى خۆى له كچەكه بكێشتەوه، دايك و كوڕه كەمتەرخەميان نواند، بايەخيان بۆ قسەكه دانەنا.

ڕۆژى گواسـتنەوه، خـزم‌و خۆيـشانى كـچە لـەنيوەى ڕێگـا، ڕێ لـە سـوارانى بووك گواستنەوه دەگرن، به قوونـه شـەڕ بەرەو ئەوانديّن، هـاوار دەگاتـه زاوا، زاوا لـێ سـوارى مـاينى حـەدوودى دەبـێ، يـەك ڕكێـب جلـەوى هـەڵناگرێ تـا دەگاته شەڕەكه، شەڕى قەيره بەرانانى دەستى پێكرد.

خێرخـوازان زۆريـان هەوڵـدا، ئێـسك نەشـكى، ئـەنجام زاواو دووكـەس لەبـەر هەڵستكاران ئەمن‌و تو خۆش.

## 138- هاوينان شل‌و مل ، زستان جەوار له مل.

زێـد بـەگى ژن‌و پياويـان ڕێكوپێك‌و كۆكن، تـا دەسـت هـەڵبڕى كەڵـەگتن، نـاو قـەد باريـك، پێشـچاو، حـەز لـەخۆ كـەرن، ئەوەنـده خـۆ بـەدواى كاروكاسـبى، ماڵوماڵـدارى خــەريك ناكـەن بۆيــه بـه زۆرى ژيانيــان بــه هــەژارى‌و نــەدارى دەبەنەسەر، زستان داهات جەواڵيان بەشانەوەيه، بۆ وامكردن.

**139– هەتا ئەتو مەلا بی، ئەو سەرگەورەی چاو کوسکە کێخوابی، ئەو گوندەش لەوەندەی ئاوەدانتر نابی.**

دەگێڕنــەوە ســاڵێك لــەم دەشــتی قەراجــەی هــەولێرە، نــاوە نــاوە لــە دەو خەندەکی بابە خەلیفەی هەڵیان دابوو، تا بەهار بەسەر چوو، بەهار هاتە کزی گیا نێر بوو، خاوەن مەڕو ماڵاتو وڵسات کەوتنە گەڕانەوەی دروونەی جۆیان. لەبەر پەلەکردن، پیرە سەگە بۆرو پیرە کەلەبابی جاقی لەکۆنە هەواری بەجێ دەمێنـێن لەناچاری بـەزمانی حـال کەوتنـە گفتوگـۆو چـارە دۆزینـەوەی خـۆ بەڕێوەبردن، تا درێژایی دوا تەمنیا خزمەتی مرۆڤیان کرد، تا لەدواییدا مافی سپلەی بەزەییو ئەرکەکانیان بدەنەوە، بەرژەوەندی ئەمڕۆ ئاگای لە چاکەی دوێنێ نەماوە.

سەگەکە بە کەلەشێرەکەی گوت: تۆ دەست بکە بە بانگ دان، منیش خۆم لە بن پووشو پەراشی ئەم کەندرەکەی تازیە دانەکە دەشارمەوە، بەڵکو دەرامەتییەك بۆ من پەیدا دەبێ، تۆش لەژێر سێبەری بەسەربەستی بژی، ئەگەر ڕێوی هات پارێزت لێبستنی، وردە وردە خۆت بکێشەوە دواوە، تا دەگەیتە لای من ئەو کاتە منیش تین دەدەمەبەرخۆم دەیگرم.

کەلەشێری جاقی، قوو قوو دەستی بە بانگدانێ کرد، گەیشتە بەر تەپۆلکەکە، دیتی ڕێوییەك بەکشوماتی لەسەرخۆ پارێزی لێدەستاند.

کەڵەباب کەوتە پاشەکشە، ڕێوی پەلەی کرد، جانگی کرد: ها مامۆستا دیارە دەنگـت زۆر خۆشـە، منـیش حاجییـەکی دەوڵەمەنـدی خـواییم پێویـستم بـە مەلایەکی وەك تۆیە بۆم بانگ بدات، مەڕۆ با چاکوچۆنییەك بکەین!

کەلەشێرەکە بە پاشەکشەوە گوتی: لەوەباشتر نابێت، من مەلای ئەم گوندەم، کێخواکـەی تـازەی ئـاوەدان کردۆتـەوە، وەرە تـۆش ببـە بـە وەرزیـڕی، چـەند بەراو دەکێڵیت بکێڵە خواپەرستیش دەکەین!

لـەم كاتـەدا كەلەشـێر بـێترس بـوو لەسـەر هـەردوو لاقـەكانی ڕاوەسـتا ، ڕێـوی زیرەك لەدڵی خۆیدا گوتی: ئەو ماستە موێكی تێدایە، سەیری كرد، ئەوا پیرە سـەگ لـەنێو پووشـو پەراشـەوە، چاوەكانی دەتروسكێنەوە، گـوتی هـەتا ئـەتو مەلا بی ئەو سەرگەورەی چاوكوسكە كێخوابی... .

## 140- هەر بریٚ حەمەد نیمە.

پیرێژنێك تاكە كوڕێكی تاقانەی هەبوو، كوڕە پیرە دایكی بەخێو نەدەكرد، پیرێژن ئاگاداری كرد، ئەگەر یارمەتی نەدات لای فلان سكاڵای لێدەكات، دادی نەدا. پیرێژن لەخۆ كەوەڕی بوو، چوو لای ئاغا سكاڵای لێكرد.

ئاغا سەركارێكی خۆی وەگەر خست، بچێت كوڕە بهێنی.

پیرێـژن سـكی سـووتاوە، ئاغـە بیگرێـت ماركوژی دەكـات، سـزایەكی زۆریـشی لێدەستێنیٚ، پیرێژن پیاوێكی نەدیتو نەناسی دیت، گوتی ئەوە هەوە.

سەركار كابرای پیل گرت، بردیە لای ئاغای، ئاغـە تێروپـڕی لێـدا، كـاویٚ خـۆی پێدەركرد، كابرا گوتی: ئاغەم بزانم لەسەر چی لێمدەیت، نابی تێبگەم.

ئاغە بۆ حەمەدۆك نازانی؟ ئەوە پیرە دایكتە، بەخێوی ناكەی؟

كابرا ئاغە وەڵلاٚ نایناسم، هەندەی تری لێدا، كابرای لێدراو لەبەر زەبری لێدان كەوت، گوتی باشە ئەوە دایكمە، چ دەڵێن تا وابكەم؟

هـەتا مـاڵی دایكـت لـە پـشتیٚ بكـە، دایكـی لـە پـشتیٚ كـرد، بـەرەو مـاڵی پیرێـژن بوونـەوە، لـە ڕێگـا لێیـان دەپرسـی ئـەوە كێیـە لـە پـشتت كـردووە، كاكـە ئـەوە دایكی... . ئـەم پیرێژنـە بـە زۆر كـراوە بـە دایكم! هـەر دەرێم حەمـەد نیمـە، داد نادات... .

* ئەم پەندە بەكەسێك دەڵێن لـەختوخۆڕایی تووشـی بەلایـەكی بكـەن، ناچـار ملی بۆ كەچ بكات.

**141– هەر کەسە بەمنیٚ خۆی.**

دەڵێن ڕۆژێك سمۆرەیەك: بۆ هاو دۆستەکانی دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەسەر دارێك بەربوومەوە، منێك گۆشتم لێلووەوە، یەکێك دەڵێت: ها سمۆرە خۆت چییەو منت چییە؟

سمۆرەکە دەڵێت: هەر کەس بەمنیٚ خۆی.

* ئەم پەندە ئەوە نیشان دەدات ، هەر کەسە لەناو هاوچشنەکانی نرخی خۆی هەیە.

**142– ا– هەر هەویلیٚ ، سەرگەورەی قوون تەقێلی.**

**ب– هەر هەوی ناوێرم برێم.**

کابرایەکی ئەوسەرەوە، کەرێکی ڕەو هانی باشی هەبوو، بە گەرمو خۆشی، بە پشتی ئەو کەرە چووە بەغدایی،ٚو گەڕایەوە، هاتەوە، لە ڕێگا بە پیرۆزترین، ژنەکەی سوێندی خوارد پێت ناریٚم کەر، واتە گویٚ درێژ نی، بەرزەی.

کابرا ئەمجارە بە زستان بۆ سەردان دەچێت، دەگاتە نزیك کانی وەتمانیٚ، کەرەکەی لە قوڕیٚ دەوەستی، ناوێری بڵیٚ هەچە، بۆ کەر بەکار دێت، نەوەك دەستی لە ژنەکەی ببیتەوە، دەڵێت: هەرهەوی ناوێرم برێم.

* ئەم گۆتەیە بە یەکێك دەگۆترێت لە نرخی خۆی زیاتری پێدرابیٚ، ئەوەش هەڵنەگرێت.

## 143- هەرێ نەنێ، هەر نەنێ، قایل نەبووی بە مەفتەنێ، تا لێیاننای بە ترخێنێ.

پیرێژنێکی تەڕ پیر دڵی دەگێڕا، تاقە کوڕێکی هەبوو، بێزاری کردبوو، لەوێ دەیبردە وێ کوڕەکە دەڵێت: ئەرێ دایە بۆ ئەوەندەم دەگێڕی؟ چیت دەوێت؟
دایکە دەڵێت: گوڕەکەم دەمەوێ بمبەیە وڵاتێك مردنی لێنە بێت، دەگەڕێن تا دەگەنە شوێنێك، دەپرسن لێرە مردن هەیە؟ خەڵکەکە دەڵێن مردن چییە؟!
پیرێژن دەڵێت: ڕۆڵە ئێرە بۆ ئێمە باشە، عەیامێکی لێدەدەین، دایکە ڕۆژێك دەست بە نکەنکێ دەکات، کوڕەکەی بۆ کار دەردەچێت، دەگەڕێتەوە، دایکی نەماوە، بە برسێتی دەمێنێتەوە، دەرو دراوسێ شیوە غەریبەی بۆ دەهێنن، کوڕە سەیر دەکات ئێسك و پروسکی مرۆڤ لەناو چێشتەکەدایە، دەپرسێت ئەوە چییە، دەڵێن ئەوە گۆشتی دایکتە، لای ئێمە کەسێك لێی نائومێد بووین، پەل پەلی دەکەین بەسەر دەرو دراوسێدا دابەش دەکەین، دەیخۆین.
کوڕە گڕ دەسێنێت دەڵێت: هەرێنەنێ ، هەرێ نەنێ قایل نەبووی بە مەفتەنێ... .

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن بۆ مەبەستێك خۆی ئاوارە بکات ئەنجامی خۆی لەسەر دابنێت.

## 144- هەیش، هەیش بە دوو ڕێوییان شێرەکیان کوشت.

پیرێژنێکی لادێیی، کوڕێکی ئزاو نەبەردی دەبێت، ڕۆژێك لەگەڵ دوو پیاوی بێدەسەڵات بەشەڕ دێن، کوڕە دەکوژرێت، پیرێژنەکە کە لەناو شینێ بەلەخۆدان : هەیش هەیش بەدوو ڕێوییان شێرکیان کوشت.

* ئەم گۆتەیە بەکەسێك دەڵێن یەکێکی لە ئاوقەرانی خۆی نەبێت، بەسەریشدا زاڵ بێت.

## 145- هێدی جەفتە.

دوو دەروێش، بە سواڵکەری دەچنە گوندێك لە برسانا لاکەیان لێوە دەهات، سەیر دەکەن لەماڵێك مەنجەڵێك لەسەر ئاگر دەکوڵێت، وا دەزانن قاوقلیانە، یەکیان بەگەرمی دەست دەکات بە دەفە لێدان، ئەو یدی کەس لەویٚ نابیٚ، خۆ دەگەینتە مەنجەڵی، سەری لەسەر هەڵدەداتەوە، دەبینی جەفتە، لەگەڕانەوەدا دەڵێت هێدی جەفتە.

## 146- هێرکە مەڕی، هەمووی پێدەم.

مەڕدارێك مێگەلە مەڕێکی باشی هەبوو، کوڕەکەی شوانی پەزەکان بوو، مەڕەکانی زۆر خۆش دەویست، لەچۆلەوانی بەدوای لەوەڕگا خەریك بوون، هیچی لەخۆشی ژنو مێردایەتی نەدەزانی ڕۆژێك باوکی کوڕە دەیەوێت هەندێك لەمەڕەکان بفرۆشیٚ لۆ کوڕەکەی بەژن بدات، کوڕە گوتی هەر مەڕێك بە ژنێك نادەم.

باوکی دەزانی هیچی لێنازانی، دەینێرتە ماڵی خاڵی، کەتازە ژنی بۆ کوڕەکەی هێنابوو، کوڕەکە چاوی بە بەزم و ڕەزمی بووكو زاوا کەوت، دەگەڕێتەوە لای باوکی، لە دوورەوە بانگ دەکات: هێرکە مەڕی هەمووی پێدەم.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن لە نەریتێك شارەزا نەبێت، کەدەزانی خۆی ناوێت.

147- ا- ئاگر له سەفین، مەنجەری ئاو لێرە کو دەکوڕێ؟
ب- هێلکەو ڕوونی سەر کولانکەی.
ج- خوشکەکت هەیە لە بالیسان، دەکا تڕو تسان، نانی مە دەبتە سەپکی سەیان.
د- خوشکەکت هەیە لە سوندوس، دەکا تڕو تس، ئاردەکەی دەبا دەمینێ بنووس.

کابرایەکی کێم ئەقڵ، نادان، ژنێکی ئۆینبازی هەبوو، ژنە سەرگێڕی دەکرد، زۆربەی ئاردە وردەکەی دەکردە قاوقلیان دەرخواردی دۆستەو خۆشەویستەکەی دەدا.

ڕۆژێك مێردەکەی دەڵێت، ئەرێ ژنەکە ، نانەکەی مە بۆ هەندە خراپە؟
ژنەکە: پیاوەکە چەند سادەو ساویللکەی، ئەی نازانی خوشکەکت هەیە لە بالیسان دەکا تڕو ... . ژنەکە بە بەردێك دوو کێل دەپەڕێنێت، یەکەم وەڵامی مێردەکە، دووەم هاتوچۆنەکردنی مێردەکەیو خوشکەکەیتی.
کابرای گێلە پیاو بە پەشۆکاوی سەر هەڵدەگرێت، دەچێتەی لای خوشکەکەی، دەڵێت:
ئەرێ خوشکم ئەتو بۆ ئەوەندە تڕو تسان دەکەیت نانی مە نابتە نان.
خوشکەکە زیرەك دەبێ، براو براژنەکەی خۆی دەناسی، بەمەبەست دەیەوێت هێلکەو ڕوونی بۆ براکەی دروست بکا، هێلکەو ڕوونەکە لەسەر تاخچەی نادینەکە دادەنێ، ئاگر لە قۆرتاناگر دەکاتەوە، دەمێك و دووان، پیاوەکەی برای خوشکەکە لە برسان جووڕەی لێوە دەهات، دەڵێت: خوشکم هێلکەو ڕۆن لەم بڵندە، چۆن دەکوڵێ؟!

**خوشکەکەی دەڵێت : کاکە، ئەدی چۆن لێرەڕا فسی من کار لە ئاردی ئێوە دەکات؟**

**کابرا کەمێك هۆشی دێتەبەر کەللەی، لە تەشکی خۆی دەدات دەگەڕێتەوە.**

*** ئەم پەندە بە کەسێکی ساویلکەو کەمزان دەڵێن بڕوا بە هەلەیەك بکات لە ئەنجامدا هەڵەکەی بۆ ساغ ببێتەوە.**

## 148- ئاخیری دەبتە خشە خش.

**لەسەردەمانێکی زوو، سەردەمی بێکاری، سەردەمی کۆڕ گەرمی دیوەخان، هەر کەسێك بوێرو قسەزان بووایە، لەدەرفەتی شیاو کەرخی خۆی بە دەردەخست، کەسانی سادەو ساکار دووانەکانی ئەوانیان لەم جێگا بۆ ئەو شوێن دەگوازتەوە، جار وا دەبوو مرۆڤێکی کەودەنیو کەم توانای نا ڕەوەست بەخۆی نەدوەستا بە هەلە خۆی دەخستە ئەو تۆڕەوە.**

**دەڵێن ڕۆژێك یەکێك لەم ناتەواوانە لەناو کۆڕی دیوەخان گوتی: خزمینە ئەمڕۆ لەکەندی شیوەسوور سیو سێ کەروێشکم دیت، ئامۆزاکانی دەستیان کرد بە پێکەنین و گاڵتە کردن پێی، گۆتیان: کەروێشك لەدێر ڕۆژگارەوە ڕەوەی نابەستی، سیوسێ گەلێك زۆرە.**

**کابرای نا ڕەوەست گوتی: پازدە بوو، گوتیان هەر زۆرە، گوتی نا پێنج بوو، گوتیان هەر نابێ تا ئێستا کەس دوو کەروێشکی کیوی بەیەکەوە نەدیوە، گۆتی گویێم لە خشە خش بوو.**

*** ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن قسەی ناڕاست بکات، ئەنجامەکەی بێتە سەر هیچە.**

## 149- ئاخیری هەنجەتی جاشکێم پێدەگری.

پێشتر کەم ماڵ لەم کوردەوارییە هەبوو، یەك دوو کەری نەبی بۆ جێبەجێ کردنی پێویستی ژیانی ڕۆژانەیان، کەر قەوچو قەڕاسەی هەبوو دەبسترایەوە، خۆ ئەگەر کەرەکە ماکەر بووایەو جاشکی لەبەر بووایە، جاشك نەدەبەسترایەوە بەرەڵڵا بوو، جاشك ناڕەوەست بوو زیانی بە دەغڵو دانو بێستان دەگەیاند، یەکدو لاوی بەهێز دەورییان دەدا دەیانگرت، یەکێکی بەهێز دارێکی دەخستە بن سکی توندی دەکرد، یەکێکی تر کلکی بڵند دەکرد بەمستان بەهێزو توانای خۆی لە بن کلکی دەدا. جاشك هەر دەم زۆر تێربوو، خۆی پێنەدەگیرا دەمارەکانی شل دەبووەوە، بای یەك لەدوای یەك لێبەر دەبوو. گەنجەکان تێر تێر پێدەکەنین، جاشك کلکی ڕەپ دەبوو ، بەریان دەدا یەك ڕکێب تا لای دایکی بەزۆرە زۆر غاری دەدا.

* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن لە بیانۆ گرتن بترسێ، گۆبەندێکی پێ بکەن.

## 150- ا- ئەو ڕۆ ئاش سبەی تەڕاش.

## ب- ئاشەوان چ دۆست، چ دوژمن.

ڕۆژێك کابرایەکی دوژمنداری ئەو سەرەوەی ناوچەی خۆشناوەتی، لەسەردەمی ئاشی ئاوێ باراشیان نامینێ، ئاشی ئاویش بەو لەسەرەخۆییە، دەستێکی دەکەوێتە پاش، دەستێکی دەکەوێتە پێش، ماڵ و منداڵ باراشیان نەمابوو، لەگەڵ ئاشەوان دوژمنایەتیان هەیە، ناچاری زۆر شت بە مرۆۆ دەکات، دەڵێت ئاشەوان چ دۆست چ دوژمن! خۆمندالآن لە برسان ناکوژم، باراشی بار کرد بۆ ئاشی باراشهێرێکی بێ باك بە گوێی چرپاند: ئەرێ فلانی، تۆو ئاشەوان دوژمنکارییەكو نەبوو.

کابرای باراشهێڕی دوژمندار: ئەوڕۆ ئاش، سبی تەڕاش، واتە ئەمڕۆ باراشی بۆ زارۆکان لێدەکەم، بەیانی لەپەنا تەڕاشێك خوێنی خۆمی لێدەسێنمەوە.

* ئەم پەندە بە کەسانێك دەڵێن نەتوانن سەرپێچی لەکارێك بکەن بەڵام مەبەستی خۆی هەر لە بیربێ.

## 151- چاوت ببیتە گیسکی هەیاسی ، نابینی بابی ئەلیاسی.

- ئەم چیرۆکە با لەناو کوردیش باوبێ دەدرێتە پاڵ چیرۆکی هەیاس و سولتان مەحموودی غەزنەوی.

دەگێڕنەوە دەڵێن: هەیاس ڕۆژێك لە سوڵتان مەحموود زویر دەبێت، دەڕوا ڕوو دەکاتە گوندێك دەبێتە شاگردی ئاشەوانێك. سوڵتان بۆ دۆزینەوەی هەیاس لەشوێنی مەبەست و گومانلێکراو، سەرو گیسکی بەسەر ماڵاندا دابەشکرد، داوای لێدەکردن پاش مانگێکی تر وەریان دەگرینەوە، نابی نەزیادیان کردبێ نەکەم ئەگینا لەسەرتان دەدرێت.

ئاشەوان زۆر پەست و شڵەژا شاگرد- هەیاس- گۆتی لەکن کەس دەنگی مەکە بڕۆ لەم دۆڵ و هەردەیە بێچووە گورگێکم بۆ بهێنە، تۆد ڵنیابە.

شاگرد- هەیاس- شەوان گیسك و بەچکە گورگی لەهۆڵێك دەکرد، گیسك زراوی دەچوو لە ترسان چاووی بلۆق دەبوو، بە ڕۆژ لێکتری جودا دەکردنەوە، گیسکی تێر تێر دەکرد. پاش مانگەکە گیسکی ئاشەوانی بە زیرەکی هەیاسی وەك خۆی مایەوە، گیسکەکە نەزیادی کرد نەکەم بەم تەگبیرە سولتان هەیاسی دۆزییەوە.

* ئەم پەندە کەسانێك دەیڵێن واتە بەهیچ جۆر کارەکە مەبەست نادرێت.

**152– کێف لە من ، کێف لە گوندا، کوڕە خنکا پەشلیٚ مندا، هێشتا هەوای من زۆر بڵندە.**

دەگێڕنەوە دەڵێن: لەمیرە دێیەکی ئەو وڵاتی سەرەوەدا، ئافرەتێکی ناسكو نازدارو شیرین هەبوو، ژنە ناوبانگی جوانی، لەخۆی بایی کردبوو، ژنە بە نەریتی چەواشەی سەردەمی خۆی درابووە کابرایەکی لەخۆ بە تەمەنتر، ژنە گڕوگفی هەرزەکاری دانەمرکابووەوە، سەرگێڕی دەکرد، بەدوای ڕاوکردنی کوڕو کاڵانی هاوتەمەنیدا دەگەڕا. ژنەی چەمبەری ڕۆژێك لەبەر سەرقاڵی چاوچاوانیٚ ئاگای لە کۆڕپەی ناو پاشۆلی نەمابوو، کوڕە لەناو پاشۆلیدا خنکابوو.

منداڵ، خەڵکی ئاوایی دەستووبرد بردیان لە گۆڕستان شاردییانەوە، ژنە سکی دەسووتاوەو هەستی بەکەمترخەمی خۆی دەکرد، ژنان دەهاتن بۆ سەرەخۆشی دڵدانەوە، ئەویش لەناو کۆڕی ژنان دەهاتوو دەچوو دەیگۆت: کێف لە من، کێف لە گوندا، کوڕ... .

* ئەم پەندە بەکەسێکی جگەر سووتاو دەڵێن، لەبەر کەمتەرخەمی خۆیو زۆر لێکراوی تووشی لێقەومانێکی گەورە بووبێت، هێشتان خۆی لێدەرباز نەکردبیٚ.

**153– گورگ ئەتو قەسابی ، کیشت لەنار بەندییە.**

دەگێڕنەوە دەڵێن: لە نێرینەی بەهارێکی تەڕدا، ئێسترێك تێر گیای خوارد بوو، لەکەتیەوەك، یەك بەخۆی لێراکێشابوو، لە پڕ گورگێکی گەیشتە لا.
گورگ: ها ئێستری بەدکار ئەوە بۆ هاتوویتە نێو پاوانی هەردەی من، هەر ئێستا دەتخۆم.

ئێستره شەلە بیری کردەوە لەبەر دەستی ڕزگاری نابی، گوتی: هەر دەمخۆی بەس بزمارێك لە لاقی ڕاستم لە زەندەی چوویتە خواری، بۆم دەربهێنە، ئەو کاتە سەرفیرازی خواردنم بە، لەگیانت خۆش بی.
ئێستر هەستایەوە کەمێك لاقی بۆ لای سنگی کیشایەوە، گورگ دەمی گەیاندە بزماری ئێستر بەهەموو هێزو تواناکییەوە لەقەیەکی لەنێو چەوانیدا، هەردوو چاوی دەرپەڕاند، گورگ کەوتە ئەو گۆڕەی، ئێستر بە لووشە لووش تەقرە کوت غاریدا.
مام ڕێوی بەلای گورگدا تێپەڕی هەر ئەوەتە نووسکەی دەهات گووتی: ها مام گورگ چ خێرە؟ گورگە سەروبەری بەسەرهاتی بۆ گێڕایەوە.
ڕێوی ، گورگ خوا بتگری : ئەتوو قەسابی کیشت لەنار بەندییە؟
* ئەم پەندە بەکەسێکی کەمزان ، لەختوخۆڕایی گیانی خۆی لەسەردانی بەکارێك هی ئەو نەچیٚ.

## 154– جوو هەزار لیرەی دا شەوەکی منداری لەجێیان نەنوی.

سەردەمانێکی زوو، پێش ئەوەی جوو لە کوردستان کۆچ بکەن بۆ فەلەستین، مێرد منداڵێکی جووەکی دوکانداری ئەم شاری هەولێرە لە باوکی زوێر دەبێت، دەچیتە ماڵی دۆستێکی موسلمانیباوکی زۆر هەراسان دەبێت، لە ناو دووکانداراني دەوروبەری بلاوی کردەوە گوتی: هەرکی ئەمشەو کوڕەکەم بۆ بهێنێتەوە، لەجێیان نەبیٚ، لیرەکی تەواوی دەدەمیٚ.
یەکێك لە دوکاندارەکانی نزیکی دەیزانی کوڕەکەی لەماڵی کێیە؟ لەدڵی خۆیدا گووتی ئەمشەو بۆی نابەمەوە، بەڵکو بەیانی دوو لیرەی لێدەستێنم.

ڕۆژی دووەمــی زیزبوونەکــە، کــاتی کێــشتەنگاو، چــووە لای بــاوکی کــوڕە زیزبووەکە گۆتی: فلأنی ئەریٚ ئەمن ئەگەر کوڕەکەت بۆ بهێنمەوە ، چەند پارەم دەدەیتی؟

جووەکە: هیچ

دوکاندارەکە: تۆ دوێنیٚ لیرەکت دەدا، ئەمڕۆ هیچ ئەمە لەبەر چی؟

جووەکە کە من لیرەکم دەدا بۆ ئەوەم بوو، کوڕەکەم شەوێك لەجێیان نەبیٚ، شەوێك لەجێیان نووست، تازە هیچی تیٚ نەماوە.

* ئەم پەندە زیرەکییەکەی لەوەدایە منداڵ تێکەڵ پەروەردەی خەڵکی جێیان نەکرێت.

## 155- زستان سەپانە ، هاوین تێلەکێش.

دەگێڕنەوە لەو دەشتی هەولێرە، کابرایەکی گێکەڕ خزمەتکاری ئاغەیەکی پڕ کار بوو، کابرایەکی زۆر بیٚ دەسەڵات بوو، بەردەوام کاری ناو ماڵ‌و دیوەخانیان پیٚ دەکرد، ئەو کارەی نەدەشیا ئەو بیکات ژنان پێیان دەکرد.

زستانێکی لەپاش دیوەخان هاتە گەرم بوون، لەناو دیوەخان خۆی هەڵدەکێشا دەیگۆ سەپانی چاك، سەرپاڵەی لێهاتوو دەبی لەگازی دروینە دەبیٚ، وابچتە گازی ، وا بەری دروینە هەر بڕی.

جوامێرێکی قسە لە ڕوو لێی ووردبووەوە، چاکی دەناسی گۆتی: زستان سەپانە، هاوین تێلەکێش.

* ئەم پەندە بەکەسێکی کەسایەتی لاواز دەگۆترێت، کاری نەشیاوی پیٚ بکەن لەسەر نەریتی باوی گەلەکەی لانەدات.؟

## 156- خەرتەلە بە بن باری خۆیدا دەڕۆنی.

وە بیرم دیٚ لە سالآنی چلەکاندا، خەرتەل گەلیٚك زۆر بوون، هەر گیانلەبەریٚك مردار ببوایەوە، وەیا بتۆپی بووایە، دەمو دەست خەرتەل بە قاژە قاژ لەسەری خڕ دەبوونەوە، زوو زوو لەناویٚیان هەڵدەگرت، تەنیا ئیٚسقان دەمایەوە. سروشتی خەرتەل وایە، چ لە سەرپیٚییان ڕۆیشتن وەیا لەسەرخواردنی کەلەش باڵیان لیٚکدەکەنەوە. خەڵکی کوردستان وای بۆ دەچوون خەرتەل سەیری بن باڵی خۆیان دەکەن، دەزانن کە لەشی فڕیٚدراوی مردار، تۆپی لەکویٚ هەیە.

* ئەم پەندە بەکەسیٚك دەڵیٚن ئەوەندە هۆشمەندو زیرەك بی، زوو هەست بەمەبەست بکات .

## 157- لۆچاوی بەرەکی خۆم کۆرە دەکەم، نەمردی ئاگای لیٚیە، نەزندی منەتی پیٚیە.

من وای بۆ دەچم سۆزو خۆشەویستی خزم و دۆست و ناسیاوان جاران سەردەمی کەرتی کشتوکاڵی لە ئیٚستا بەهیٚز تر بوو، نەریتی باو هەبوو، سەرپیٚچی کردنی کاریٚکی ناهەموار بوو، بەندو باوی دروست دەکرد. نەریتی شین وابوو، یەکیٚك بمردایە، ژنان بازنەی شینیان دروست دەکرد، ڕووی خۆیان دادەماڵی، قژیان دەڕناندەوە لە زەنگەی باسکیان دەئالآند.

ڕۆژیٚك مردووەك شینی بۆ دەگەڕا، ژنیٚکی دڵ ڕەقی خۆپەرست دەڵیٚت: لۆچاوی بەرەکی خۆم کوڕە دەکەم نەمردی ئاگای لیٚیە، نەزندی منەتی پیٚیە.

* ئەم پەندە بە مرۆڤیٚکی خۆپەرست دەڵیٚن لە نەریتی باو لابدات.

**158- ئەوی هەق بڕێ ، کراوی دەپەڕی.**

**کوردی ژێر دەستە زۆربەی ڕووداوە بەپێزو بەها دارەکانی دەداتە پاڵ یەکێك لە دەسەڵاتدارانی بێگانە، بۆ نموونە ڕووداوی خەلیفە هاروونە ڕەشیدو بالوولی بەغدایێ.**

**واباوە / بالوول برای هاروونە ڕەشید و پیاوێکی دەلوو دێوانە و ڕاستگۆ بووە.**

**دەڵێن: ڕۆژێك خەلیفە هاروونە ڕەشید پرسیارێك لە بالوول دەکات. بالوول بێ پەناو پێچ بازاڕی، بە زەقی وەڵامی پرسیارەکەی دەداتەوە.**

**خەلیفەی سەرخۆشی دەسەڵات، وەڵامەکەی لە دڵی گران دەبێت، شەقێکی لە بناگۆیی دەدات، کراوی لەسەری دەپەڕێت.**

**بالوول کراوەکەی بە زانایی هەڵدەگرێتەوە دەڵێت: ئەوی هەق بڵێ کراوی دەپەڕی.**

*** ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن لەسەر ڕاستگۆیی خۆی تووشی نووشستی هاتبێت.**

**تێبینی:**

1) **بۆ چوونی وا هەیە: بالوول برای هاروونە ڕەشید نیە، بەلکو حەللاجە زانای گەورەو بەناوبانگی ئیسلامە، لەترسی هاروونە ڕەشید خۆی شێتۆکە کرد، ئەنجامەکەی بەزەهر کوژرا.**
2) **دوور نییە ئەم ڕووداوە لە دیوخانەیەکی کوردەواری لەنێوان برا گەورەیەك و کەسێك ڕووی دابێت.**

## 159- هەر پەڕە شاییە، بووکە بەخۆڕاییە.

پشتاو پشت بۆمان دەگێڕنەوە دەڵێن: لە گوندێکی ئەم کوردستانە، پیاوێك هەبووە، کوڕە گەورەکەی کاتی ژنهێنانی هاتبوو، بەمەبەستی خوازبێنی کچە شۆخە برازاکەی دەچێتە لای تاقە براکەی.

تاقە براکەی باوکی کچە، بەبێ شیربایی و داواکردنی چەکە خاڵانە بوێرانە پێشکێشی دەکات.

باوکی کوڕە دەچێتە جلکان، پێویستیەکانی ژنگواستنەوە جێبەجێ دەکات، بەپێی نەریتی باو ڕۆژی دووشەممە، کچە دەگوازرێتەوە، ئاهەنگی شایی گەرم دەبێت بووکە دەبەنە ناو گەڕی شاییێ.

کچە لەناو شاییێ گوێبیست دەبێت دەڵێن: هەر پەڕە شاییە، بووکە بە خۆڕاییە، کچە ئەم گۆتەی لەدڵ گران دەبێت، لای وا دەبێ سووکیە بۆ ئەو، لە شایی بە پەستی دێتە دەرەە دەڵێت: ئێستا باوکم بێتە ئێرە. لەدوای باوکی دەنێرن، باوکە دێت کچە گۆتە ناشایستەکەی بۆ باوکی دەگێڕێتەوە دوای بینەو بەردەیەکی تەواو خێرخوازان دەکەونە نێوانەوە، توانیان باوك و کچەکە دڵ بدەنەوە، سەرپێچکەری زمان درێژ سەرزەنشت دەکرێت.

* ئەم پەندە بە مرۆڤێك دەڵێن ئەنجامی زمان درێژییەکەی، دوانی بێ بیر کردنەوە، خۆی تووشی سزاو زیانێك بکات.

## 160- لەبەر هوردە کێران ، بەرم بەدرشتە کێران وەنییە.

باوك و باپیران دەگێڕنەوە دەڵێن: لە ڕۆژگارێکی بەر لەم سەدەی بیستەمە، لەم کوردستانە ڕەنگینە، ژنێکی ساڵۆس و تەوەزەل هەبووە، ڕۆژانە، کاتی کاروکێری خاو خێزان، دەچوو مشتێك لە جۆرە دانەوێڵەکانی ناو هەمبانەی

ماڵو نانـدینی دەهێنـا بـە گـۆڕێی وەردەکـرد، پاشـان لەسـەرەخۆ لەسـەر چینچەکان دانە دانەی خڕ دەکردەوە.

ڕۆژێك و دووان خەڵكی هەستیان بەکارە بەد ڕەفتارەکەی ژنەی زەمتە کرد، لێیان پرسی: ئەرێ خاتوون، ئەتو لەو پڕکارییە، سەرقالییە، ڕۆژانە چ کارەی؟ بەچی خەریکی؟

ژنە بێ سڵەمینەوە، لەسەرخۆ دەیگۆت، لەبەر هووردە کێران، بەرم بەدرشتە کێران، وە نییە.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن لەجیاتی ئەنجامدانی کاری تایبەتی خۆی، کارێکی لاوەکی بۆ خۆدزینەوە ، بۆ خۆی دروست بکات.

## 161- مەقریۆکە ، ناو لنگانۆکە.

لەسـەردەمانێکی کـشتوکاڵی، کـوردەواری هـەر کـوڕەکی دەسـتی ڕاسـتو چـەپی خـۆی بناسـیبووایە، دایکـی لای بـاوکی کـوڕە پێـشنیاری ژنهێنـانی بـۆ کوڕەکـەی دەکـرد. باوکـە هـەر چـەند بێگۆتایـە ژنەکـە کـوڕە هێـشتا منداڵـە خـاوخێزان دەبوونـە یـەك دادی نـەدەدا. ڕۆژێـك و دووان بیرکردنـەوە، هـەموو لا دەکەوتنە ئەم بۆ چوونی ، کیژی فیسارکە کەسی لەوان دەوەشێتەوە. سـەرەتا دایکە سـەرە پـەتکێکی لێهەڵدەکرد، دوایـی پیـاو ماقوول، جوامێران دەچوونە داخـوازی، بـەپێی نـەریتی بـاو ڕێکدەکـەوتن. لـە ڕۆژی دیـاریکراو بـووك دەگوازرایـەوە، کـچە بـۆ ئێـوارە زوو دەخرایـە ژێـر پـەردەوە، چـەنداوێکی پێدەچـوو، ئـایینو ئـۆینی خەسـوو و دایکـی بـووکی دەسـتی پێـدەکرد، زاوا منداڵـە، خۆشـی لـە بـووکی دەبـینی، قـسەی ژنەکـەی و خەسـووی لـەناخی دەروونی جێی دەگرت.

کچە باوەخوون دەکرایەوە، مریشکێکی جاقی، قوندەی دەدایی بەمەبەستی ژنــە هێلکــەی مریکــی دایکــی بــۆ مێردەکــەی لــە مــەقلی بکــات، ژنــە بــە پێــی ئامۆژگاری دایکی کوڕەی دەلاوەندەوە. باوكو دایکە کە دەیاندیت، کوڕەکەیان خـواردنی جیـا لـەخاوخێزان دەخـوات، منداڵـە بچووکەکانی بـەلاوەناوە، لەگـەڵ ژنەکــە هــۆگری یــەکتر بووینــە ئاگایــان لــە زارووکــان نەمایــە بــاوك ســکی دەســـووتایەوە دەیگــۆت: مەقریۆکــە، نــاو لنگانۆکــە. ئــەم هــەڵسو و کەتــە تەشەنەی دەکرد، ناچار کوڕەو ژنەیان دەرکرد، کوڕە دەبووە ڕەنجبـەری پیـاوی هەبووە و خاوەن کار.

* ئـەم پەنـدە بـە مرۆڤێکـی سـادە دەڵـێن بـە قسەو ئامۆژگـاری کەسـانێکی تەلەکەبازی خۆپەرست بەرژەوەندییەکی گەورە لەدەست خۆی بدات.

## 162– لەمار خەرك هەر وادەبێ.

لەسەر بردەی پێشینانە دەگێڕینـەوە دەڵێن: کابرایـەکی تامـەزرۆ، زۆر خـۆر، بەمێوانـداری دەچێتە سـەردانی ماڵـە ناسـیاوێکیان، ئـەو کاتـە چێشت لێنانـان ئێواران بوو، ئێوارە خاوخێزان کاتی نان خواردن کۆبوونەوە.

مـاڵی خانـە خـۆی بـە ڕێککـەوت ئـەو ئێـوارە چێـشتی نیـسکێنەیان لێنـابوو، لەگەنـەك نیـسكو کـەوڵی نانیـان لـەپێش مێـوان دانـا. هـەموو لا کەوتنـە نـان خـواردن، یـەکێك لـە کوڕەکـانی خانـەخۆی سـەیری مێوانەکـەی دەکـرد، کـابرا حەوت نانی تیری بەچێشتی نیسکی خوارد، ساڵەکەش نان شیرین بوو، هەموو لا دەســتیان لــەخواردن کێــشایەوە، یــەکێکی قــسە لــە ڕووی خێزانەکــە لەمێوانەکەی پرسی: ئەیٚ فلانی تێریت خوارد؟

کابرای مێوان بەنا بەدڵییەوە بریم چی: لەمار خەڵك هەروا دەبێ.

* ئەم پەندە بەکەسێك دەڵێن سنوری ئەندازەی خۆی ببەزێنێ.

## ( چیرۆکی مام ڕێوی و مریشکە قوندە )

1) ڕێوی : هەمریشکە مریشکەلانێ سینگت خۆم سیقەدانێ.
2) ڕێوی: هە چۆمە چۆمە، دنیا بە کەیفی خۆمە، دایکی جووجکان دەخۆمە.
3) مریشك : مام حەیدەرێ لە تیشی، سەر دەربینە لە تلیشی.
4) مریشك: مام حەیدەرێ دەربەندی، سەر دەربینە لەکەندی.
5) مریشك: تاژی و شوشکەدا، لەناو پووش و پەراشا وەرە دەرە.
6) ڕێوی : ئەو مقامەی مەریً دەترسێم.

دەگرێرنەوە دەڵێن : پیرە مریشکێکی سەرە مری کورك لەسەر هێلکان، لەڕەوەندایەتی لەناو پووش و پەراشی لەکۆنە هەواری بەجێ دەمینێت، ڕۆژێك و دووان ڕێوییەك لە باسك و تەلانی کونە هەواری بەمرومۆکردن پەیدا دەبێت. ڕێوی لەناکاو چاوی بەپیرە مریشکی قوندە دەکەوێت، پیرە مریشك لەبەر پیری و کورك بوون ڕووتابووەوە، بەو دیقەویق پەلاماری دایێ گوتی، بەزمانی ناخورێ، من کورکم هێلکەکانم تروکاندوویانە، جووجەلەکان لەم چۆلە وانیە گەورە دەبن. هەر ڕۆژە فرووجێکیان بخۆ، جووجەلە هاتن قەتێین بوون، ڕێوی دەستی بەخواردنێ کردن، مریشکە بە زەقە زەقی چاوان جەرگی دەسووتا.

مریشکە چێشتانەك دیتی ڕاوکەرێك بەخۆ بەجووتە تاژیو توولەك پەیدا بوو، مریشکە قوندە بەهەناسە برکێ بە پیرییەوە چوو گوتی: ڕاوچی نێچیرت دایم بێخوا بۆ ئێمەت بهێڵێ.

ڕاوچی: زار خۆش، خوا بەزارت دا بڕۆنی.

مریشك: ڕێوییەك فێربووە، ڕۆژانە جووجەلەیەکم لێدەخوات، خوا سەرفیرازت کات لەهانام وەرە، تۆڵەم بۆ بکەوە.

**ڕاوچی: خوا یاربێ، ڕێویت بۆ دەکەم بە پەند.**

**مریشك: مام ڕاوچی ناوت چییە؟**

**راوچی: مام حەیدەریێ (شاور – دەربەند)ی.**

**مریشك : مام حەیدەریێ شاوری، مریشکە قوندەت لەبەرمری، زووکە خۆ لەناو ئەم پووشو پەراشو تلیش و زندۆرە بشارەوە.**

**ڕێوی جووجکە خۆر هەندەی پێ نەچوو پەیدابووە گوتی: مریشکە قوندە بەزمەکی ، شایی نەکەین؟**

**مریشکە قوندە: مام ڕێوی هەرەتی بەزم و شاییە، ڕەنگە دەنگت زۆر خۆش بی مقامەکمان بۆ بڵێ.**

**ڕێوی کلکی داوێتە سەر پشتێ، چاوەکانی لە جووجەلان (نێچیری) زەق دەکاتەوە ددانەکانی جیڕ دەکاتەوە دەڵێت: چۆمە چۆمە، دنیا بە کەیفی خۆمە، دایکی ..... .**

**مریشك پەلەی مەکە ئەمنیش مقامەکت بۆ بڵێم، دەڵێت: تاژی و شوشکەدا لەناو... .**

**مام ڕێوی : ئەو مقامەی مەرێ دەترسێم!**

**تاژیو توولە چوار دەوری ڕێوییان گرت لەتۆزییان وەردا. مریشکە قوندەو جووجەکانی مابوونەوە، بەدڵنیاییو سەرفیرازی لەگەڵ رشاوچی گەڕانەوە ئاوایی.**

**164- دەربارەی ژن بەژنیٚ.**

**1- حاجی عەلی چاوت دەریٚ ، سەری خۆتدا لەسەر دەریٚ ، جاشکۆکەت دا بە پیرە کەریٚ.**

**2- حاجی عەلی چاوت کوٚرە، شفتیت دا بە گوندۆرە ، گندۆرە ناوی کلۆرە.**

**3- حاجی عەلی ملت شکیٚ ، بارۆکەت دا بە پیرە مریشکی - قورینگ -**

ئافرەت پێشتر هیچ دەسەلاٚتێکی نەبوو، پیاو هەموو شتێك بوو، با ئەو پیاوە هەمبانەی بای بووایە، وەیا شاخی بزنێکی پیٚ تیمار نەکرایە. پیاو ژنیٚ بە ژنیٚ، گەورە بە گچکە، بنپشکی بۆ ئارەزووی دامرکانەوەی جۆش و خرۆشی دەروونی با ئافرەت دەکرد، هەر چەندە بۆ ئەو سەردەمە لەهەندێك ڕوەوە لەکەلك بەخشین بەدەرنەبوو، بەلاٚم بە زۆری زیانی گەورەشی دەبەخشی ئارەزووی ئافرەتی پێشێل دەکرد.

حاجی عەلی (مەڕەزا) پیرەمێردێکی بەسالاٚچووی کەنفت بوو، کیژێکی زۆر نازداری پاش داکی هەبوو، ژن بە ژنیٚ لەگەڵ کوڕێك دەکات، کوڕە پیر خوشکێکی پیری ناشیرینی بێوەژنی هەبوو، خەڵکەکە کاوەکەیان پیٚ لا پرە سەنگ بوو. ئەم بەندو گۆتانەیان بەدوادا گۆتوون.

* ئەم پەندە بەکەسانێك دەڵێن کارێك بکات، زیانێکی گەورەی لێبکات.

**165- ا- پیره له مردنه ، جوانه له مێردکردنەوه ، ماره له خراپ کردنه.**

**ب- ڕێی شەغران هار دادو.**

**ج- کاکه ڕەش دیتیه خەرکی قرش پرتس.**

جاران هەژارانی شاری هەولێر، ژنانی هەژار لەدەڤەری گەڕەکەکانی شاردا بە تێلەکێشی و وشیکەری دەیانبردە سەر دەڵێن: گەورە کچێك و پیرە دایکێکی بە ساڵاچوو سەریان پێکەوە نابوو بە نەداری دەیانگوزەراند.

ساڵێك کیژە گوتی: ئیشتەم من ئەمساڵ شوو دەکەم. هەردەم بیری لە گواستنەوەو شەو بەخۆشی باغەری مێردی دەکردەوە.

دایکەم دەیگۆت : من لەسەرماو سۆڵەی زستان دەرناچم، کلکی بەتاقی دادەدەم. هاوینە هەر دووکیان داریان لەسەر بەردی دانەنا.

چارەنووسی کچە هەڵنەستا، مەرگیش لێیان میوان نەبوو، نەزانین و ساکاری مرۆڤ بە هەلە دەبات.

زستان بە سەختی گەڕایەوە، ماڵ ئەوی دەرامەت و بژێوی هەیە تێیدا نەما. کچە بەرەو دەرەوەی شار بۆی دەرچوو، خۆی گەیاندە شوێنی ساڵانی گۆڕین، سەیری کرد، جوتارێك بەلەقەلەق بەرەو شار دەهات ، کچە بە کوردییەکی پچڕ پچڕ گوتی، خاڵە ڕێی شەغران هاردادو.

پچڕ پچڕ گوتی یان دیتیه خەرکی قرش پرش.

* ئەم پەندە دەدرێتە پاڵ کەسانێکی سادەو ساکاری خەڵکی شاری، بە نەریتی. لادێییانە گۆش نەکرابێ، لە زاراوەو کارو پیشەو کاتی کارکردن ئەوەند شارەزا نەبێت، تێکەلکردن لە ئاخاوتنەکانی دا هەبێ .

* ئەم پەندە بە کەسانێك دەگوترێت لەکاتی خۆیدا ڕەنج نەدات.

**166- فەقیر لۆ فەقیرە، با هەر بخوا برنج بەشیرە.**

دەگێڕنەوە دەڵێن: ڕۆژێك لە دیوەخانی خانزادێ سۆران، باس دێتە سەر هەژاری و نەبوونی: ساڵەكان شیرین دەبێت.
خانزاد سەربەخۆ بێ بیركدنەوە دەڵێت: فەقیر لۆ فەقیرە، باهەر بخوا برنج بە شیرە گوایە برنج و شیر هیچیان تێناچێت، ئەدی ئەگەر ئەوانەش نەبن.
* ئەم پەندە هەر چەند خاوەنەكەی دیارە، بەكەسێكی نەزان دەڵێن یا كەسێك بێ بیركردنەوە خۆ تێكەڵ بە قسان بكات سەری لێدەر نەچێت.

**167- لە شەپۆلی دواوە بژمێرە.**

دەگێڕنەوە دەڵێن، باوكێك و كوڕێك لە دەوارێك لەدەم ڕووبارێك دانیشتبوون، نانیان دەخوارد. لەو دەمەدا ئاوەكە شەپۆلێكی زۆر دەكات.
كوڕەكە هەڵدەستێت بەدوای شەپۆلەكان غاردەدات.
باوكەكە بانگی دەكات: ڕۆڵە بەدوای چی دا ڕادەكەیت؟
كوڕەكە بە ڕاكردنەوە، باوكە گیان دەچم بزانم لە شەپۆلی بەراییەوە چەند شەپۆلن؟
باوكە كوڕم: لە شەپۆلی دواییەوە بژمێرە.
* ئەم پەندە بە كەسانێك دەگۆترێ خو بەكارێك بكات نەكرێت.

**168- وەرێ وەرێ ، ئەوی لەزارت دایە مەرێ.**

وا دەگێڕنەوە، ئۆبالْ بە ملێ گۆتیاری ، دەڵێن عەلی بەردەشانی، خەونێك دەبینێ، لەو خەونەدا شارە مێرووولەیەكی لە زاری دەبی، لەخەو هەڵدەستێت، خەونەكە دەگێڕێتەوە پێی دەڵێن تۆ دەبی بە شاعیرێكی زۆر چاك.

شـــەوی دووەم لـــە مەچـــێتر زەماوەنـــدی بـــووك گواســـتنەوەیان دەبێـــت، سەردارەکەیان یەك دوانێك لەدوای عەلی دەنێرێت، لەخەوێی ڕاست دەکەنەوە، بڕۆ بڕۆ دەچنە ناو شاخوداخێکی زۆر سەخت، شایی ڕمبەی دەهات.
یـەکێك لـە لەمەچـێترانی نـاو شـایی بـانگی عـەلی کـرد: وەریٚ وەریٚ، ئـەوی لـە زارت دایە مەریٚ واتە ناوی بیسملا مەهێنە.
عـەلی لـە گـەڕی دیلانـی شـەیدای خوشـکی قـورە شـینی سـەرداری لەمەچێتران دەبێت. ئەوەندە پیٚ ناچێت : ئاگای لـەخۆ نامینێت نـاوی بیـسملا دەهێنێـت، لەمەچێتران لە بەرچاوی ون دەبن.
یەکێك لەوانەی عەلی بردبوو، دەگەڕێتـەوە سـەری دەڵێت نەکـەی هـەتا بـەیانی لەشوێنی خۆت ببزوی، هەبروون بە هەبروون دەبیت.
عەلی سبیانی سەیر دەکات لەسەر لێواری خەرەندێکە ناتوانی جوولەی بکات.
چـەند ڕۆژێکـی پێدەچـێت، عـەلی زۆر زەبـوون دەبێـت لـەخوای دەپاڕێتـەوە دەڵێت:

یا خوا یا چاکی مەنداویٚ
پیرمە سووری لەسەنگاویٚ
ئەوڕۆ ڕاوکەر بێنە ڕاویٚ
عەلی دەربینین لەویٚ داویٚ.

چێـشتان ڕاوکـەران دەچـنە ڕاویٚ عـەلی لەوشـوێنە سـەختە دەبیـنین، هـاواری دەبەنـەوە گونـدی، گوریـسی ئـاوایی دەبـەن، عـەلی دەربـاز دەکـەن، دەیبنـەوەماڵەوە.
عەلی بووە شاعیرێك هەرچی دەیگۆت، نەیدەگۆتەوە.
* ئـەم گۆتەیـە بـۆ ئـەوە دەگۆترێـت، دەبـیٚ مـرۆڤ کارێـك پێویـست بـە گـوتنی نەکرێت، نەیڵێت.

**169- زیرەکی و هۆشمەندی ژن.**

**1) نەهەورە نەسایە قەت، خەبەرەك هاتیە لە کن خەلیفەت، هەتا شۆو وەرد هەنە، تۆی ماوێنە بەیاراقەت.**

**2)نەهەورە نەسایە هەتا جوان هەنە، لەگەر پیران مەنوون قەت.**

**3)نەهەورە نەسایە، مانگ ڕەق ڕاوەستایە ، دەرێن پیاوی بیٚ ئاقر ژنی خۆی تەراق دایە.**

**کابرایەکی لەخۆبایی لەو ولاتی کیستانە، سیٚ ژنی هەبوو، شەوێك گۆتییە ژنیٚ گەورە، هەڕوە دەریٚ بزانە هەورە ساماڵە هەر یەکێکیان بڵێت تەلاقت دەدەم.**

**ژنە زیرەکی دەنوێنێت، دەچتە دەریٚ، دەگەڕێتەوە دەڵێت: نەهەورە نەسایە قەت، خەبەرەك هاتیە لە کن خەلیفەت، هەتا شۆو وەرد هەنە تۆی ماوێنە بایارا قەت.**

**کابرای مێردە، بۆ دووەمجار ژنیٚ ناوەنجی نارد، بەهەمان چەشن ژنە چووە دەریٚ گەڕایەوە، گوتی: نەهەورە نەسایە قەت، هەتا جوان هەنە لەگەر پیران مەنوون قەت.**

**سێیەم جارو دواجار مێردە ژنیٚ گچکەی نارد، ژنە چووە دەریٚو گەڕایەوە، وتی: نەهەورە نەسایە، مانگ ڕەق ڕاوەستایە، دەڵێن پیاوی بیٚ ئاقر ژنی خۆی تەراق دایە.**

*** ئەم سیٚ پەندە ئافرەت زیرەکی دەنوێننی دژی لەخۆباییبوون.**

**170– چیرۆکی زستان و گیسکەنێر.**

**1– گیسك : تڕی زستانی ئەوساریش بە کێرم.**

**2– زستان ئەگەر نەمرم لێت دەکەمەوە بەفروبا ، بەزت لە کلکی دەکەمە کا.**

**3– گیسك: ئەگەر لێم دەچی ئەو زستانە، تەرك دەکەم ئەو بزن گانە.**

لەم چیرۆکەی سەرەوە سێ پەندی لێوەرگیراوە.

سروشتی کوردستان گۆڕانێکی زۆری بەسەر هۆش و بیرو بۆچوونەکانی کورد داهێناوە، لەزاری مرۆڤ، گیانلبەران، باڵندان،... گۆتراون، پڕن لەپەندو ئامۆژگاری بەهادار، ڕۆژانە پێشتر لەنوێ بوونەوە دابوون، بەسەرهات و ڕووداوی سەردەم لەهەمان چەشن سەرهەڵدەدات.

پەندوویست ئەلهایانی پەند، پشتاوشاری دەکەنەوە، ئەم چیرۆکە نموونەیە کەلەم مەبەستە. ئەگەر ساڵەکە خۆش بوو، پەرە زوو کەوت، پاش ماوەیەك گیاوگۆڵ سەوز دەبێت. گیسکە نێر زوو چرەی دەکات، خۆی تێر دەکات، لەخۆبایی دەبێت، دەپیرێنێت دەڵێت: تڕی زستانی ئەو ساریش بەکێرم.

دەڵێن زستان یا سەر وەشێنە، یا دواوەشێنە، واتە زستان زستانی خۆی دەکات. زستانی دواوەشێن، هەواو دەشت و دەر دژ دەکات، بەفروباو شەختەو بەندەرۆك، گیاوگۆل وشك دەبن، ئەستەویر ئالیکی نادرێتی، گیسك لاواز دەبێت، سرۆکییە، بەسەری دەڕوات، پایزی لەناوڕەوەستی زۆر دەرپەڕی دەڵێت: ئەگەر لێم دەچی ئەو زستانە، تەرك دەکەم ئەو بزن گانە.

### 171- حاحا ئازیکەند، نازانی ئۆمەرم.

خەڵکی ئەو دەشتی شەمامکە دەگێڕنەوە دەڵێن: مام ئۆمەرێك هەبووە، بەرەو دەشـتی قەراجـە بەڕێدەکـەوێت، لەدونـدی چـیای بڵباسـان- قەرەچـۆغ - شۆڕدەبێتەوە، لەکاتێکدا خۆی لەناو شاخ و زەندۆری ئازیکەندی دەبینیتەوە. رۆژە کە زۆر دژ دەکات، لەناکاو دایدە کوتیتە تەزرەو بارانێ، یەك دووجار ئاو لوولی دەداخۆی دەگریتەوە، مەترسی مەرگی لێدەنێشێت ڕوو دەکاتە شاخ و زەندۆری ئازیکەندی دەڵێت، حاحا ئازیکەند، نازانی ئۆمەرم؟

گـەلێك گۆتـەو پەنـدی واهـەن، جـوامێرانی شـارەزا، لـە ڕووداوی تایبەتیـدا، بەدارشتنێکی تر دەیگۆڕن.

* ئەم گۆتەیە بە کەسێکی دڵسۆز دەوترێت، کەچی تووشی ڕووداوێك ببێت بەدەگمەن خۆی لێدەر باز بکرێت.

### 172- ا- کێندەر خۆشە؟ ئەو جێیە خۆشە.

### ب- بۆ قبۆقیلەی ناو ئاوان، سەر دەربینە لەتەنکاوان ، یەك نـەمینێ لـە لاوان.

دەگێڕنـەوە، دەڵـێن: پاشـایەکی یـەك لـەو شـارانەی کوردسـتان، شـەیدای کـچێکی نـازك‌و نـازدارو نەشمیلانـە دەبێـت، خۆشەویـستی ئەوەنـدەکاری لێکردبوون ژیانی خۆیان بیٚ یەکتر نەدەویست.

دەڵـە دێـوێکی نـەفرەجا هـەبوو، لێیـان دەبێت بـە شملـی شـەڕ، ئەفسانەیەك لـە کچەکە دەکات، دەیکاتە بۆقێك، فڕێیدەداتە ناو گۆمە ئاوێك.

کـوڕە هەسـتی دەروونـی بەنهێنییـەکی دەزانـی ، چـوو لـەدەم گۆمـە ئاوەکـە ڕەشماروکەیـەکی لێهەڵـدا، خـزم و دۆسـت‌و ناسـاو لێیـان دەپرسـی، تـۆ بـۆ ناگەڕێیتەوە شار، بەخۆشی بیبەیە سەر؟ لەو چۆلەوانییە چ هەیە؟

کوڕەی شەیدا هەر هەندەی وەڵام دەدانەوە، دەیگۆت: ئەو جێیە خۆشە کەدر لێی خۆشە. گەلێك جار کچە بۆقەکە، لەگۆمە ئاوەکە ون دەبوو.
کوڕە زوو دەیگوت: بۆقبۆقیلەی ناو ئاوان، سەر دەرینە لەتەنکاوان یەك نەمینێ لەلاوان. خۆشەویستی سنووری بۆ نییە، بەتایبەتی ئەگەر لەناو دەروون مەیی بێت، چاری یا مردن یا بە ئاوات گەیشتنە.

## 173- مامۆستا وەم لۆ مارەبکە، لەدوای من بە کەلك مندارەکانی بیٚ.

دەگێڕنەوە دەڵێن: لەو وەڵاتی سەرەوەدا قەیرە کوڕێك هەبوو، لەبەر بارودۆخی خێزانی ژنهێنانی دواخستبوو.
ڕۆژێك کوڕە هەستی بەدواکەوتنی ژن نەهێنانی خۆی کرد، لەناو خێزانو دۆستو خزمو ناسیاوان، ئاماژەی پێکرد.
خێرخوازان زوو بە زوو کچێکی لەخۆ گەڕاوەیان بۆ دەست نیشان کرد، چۆنیەتی پێکهاتنیان قسە لێکرد. ئێوارەیەك پاش نوێژی شێوان، جوامێران و مامۆستا لە مزگەوتێرا، بۆ خزمایەتی چوون بۆ داخوازی و مارەکردنی کچەکە، شیرنایەتی خورا، مامۆستا لێکی مارەکردن، فاتیحە خوێندرا.
کوڕە گۆتی: مامۆستا باشت مارەکردن؟
مەلا گۆتی بەپێی نەریتی باوی ئیسلامەتی ئەنجام درا.
کابرا: مامۆستا وەم لۆ مارە بکە، لەدوای من بە کەلك مندارەکان بیٚ.
* ئەم گۆتەیە، کەسانێك دەیلێن کە بەوردی چارەنووسو ئایینەدەی خۆی نەخشە بۆ بکێشێت.

## 174- کێخوای زەنگەبات عەبات هەر کێشە.

شێر پاشای دڕندان نەخۆش دەکەوێت، هەموو گیانلەبەرەکان بۆ لێپرسین دەچنە لای، هەر کەسە خۆی وا پیشاندەدات، هەموو هەناوی بۆ پاشا هاتیتە خوارێ، ئەنجام گەیشتە ئەندازەیەك خوبزەیەکی وەکی گورگی لە وزەیدا نەما، کەوتە لێپرسینی، ئەوانەی نەهاتوون، ناپاکن، دەبێ سزای سەرپێچی خۆیان وەربگرنەوە.

کەروێشك گوێی لەم گفتوگۆیەبوو، پاش چەنداوێك دەم بەنزاو پاڕانەوە، بارەگای بەجێهێشت، بەهەلەداوان خۆی گەیاندە ڕێوی، هوردوو باریکان سیپارەی بۆ خوێندەوە پێی گوت: هەی ماڵکاولی لەمن ماڵکاوڵتر، ئەتو خۆت چیت، بەرانبەر بە کەسانێکی وەك شێر بووەستیت، تۆش وەکو ئەو هەموو گیانلەبەرانەی تر، ملکەچی لە کەسێتیت کەمناکاتەوە، ئێمە مانان نابێت لەختو خۆڕایی خۆمان لەناو ببەین، مانەوە کەلك بەخشترە، ئەوانەی بێتوانان دەبێت، هۆی خۆ گونجانیان بەهێزو باشتر بکەن، ئەمو ئەو لەخۆ ڕازی بکەن.

ڕێوی تۆزێك داما، بیری کردەوە: تۆ ڕاست دەکەیت، من براتم بێترس بە، شابازان خۆی گەیاندە گوندێکی نزیك، لەسەر جۆخینان خۆی کرد بە مردوویێکی تەواو، کەلەشێرو مریشك لەم ناوە خولیان خواردەوە بۆ دەنووك لێدانی، لەخۆی هەڵدا، دووانی قیڕە بڕکرد، خۆی دانەدیوا بەرەو دیوانی شێرە باڵی گرت، بەهەراسانییەوە کڕنۆشی بۆ پاشا برد، مریشك لەم لایە، کەلەشێر لەولایە.

شێرە لەم دەستودیارییە سەری سوڕما، هەر بەخۆشی نەوەستا، خۆی پێنەگیرا، بەتەوسەوە: ها ڕێوی ئۆینباز تازە لێمدەپرسی، ڕێویلکەیەکی وەك تو وای لێهاتووە، بەرە بەرەکانی دەستوری نەریتی باوی شاهەنشایەتیمان بکات، سەرپێچی بکەیت، هەی هەیهەی.

ڕێـوی پاشـام پایـەدار بێـت تاوانبـارکراو لـەبارەگای پاشـاو دادپـەروەران بـە بێتـاوان دەدەنرێـت تـا بەڵگـەی تاوانەکـەی بەسـەردا دەسـەپێت، بێدەسـەڵاتێکی وەك مـن خـۆی چـیەو نـەهاتنی چـییە؟ خـوا دەسـت بەتەمەنتـەوە بگرێـت بـۆ خێروخۆشی و ئاسوودەیی ئێمە.

شێر، پاشای گیانلەبەران: بـەڵێ ئەگـەر سـزا بـۆ تاوانباران نەسـەپێنم، جیهـانی دارستانەکەمان لە گشت تێکدەچێت.

ڕێـوی پاشـای گـەورەمان خـۆش بـێ تـۆ زوێـری دواکـەوتنی مـن، زۆر وارێـك کـەوتووە کەسـێك چـاکەیەکی کـردووە بەخراپـە بـۆی گەڕایتـەوە، ڕاسـتی نەخۆشـی تـۆ مـنی شـلەژاند لـەدڵی خۆمـدا گـوتم بابـە دوای چارەسـەری دا بگـەڕێم، ئێمـەمانانی بێتوانـا لـەژێر سـێبەری دەسـەڵاتی پاشـامان دڕەنـدە زۆر دارەکـان نـاتوانن زۆر پێدرێـژی بکـەن، بـە ئاسـایی دەژیـن، خـوا نەخواسـتە شـتێکی بەسـەر بێـت لانـەمان لێتکدەچێت هـەموو ئـاوارەو پەراگەنـدە دەبـین و قڕمان دەکەن، زوو بیرم لەداودەرمان کردووە، لەمام مۆرتکی خۆمانم گوێبیست بوویمە، گۆشتی فرووج دەرمانە ناچاری لەکاتی تەنگانـەدا بـۆ ئـازیزێکی وەك تۆ خۆ، گیان بخەیتە سەردەستان لەپەلە پەلیان چاوم تاریك بوو خـۆم پێنـەگیرا چـوومە گونـدی... بەنوێـژی نیـوارانی، دەرفـەتم وەرگـرت خـۆم گەیانـدە ژێـر عەمبارێك خۆم شاردەوە دنیا فێنك داهات سەگەڵ بە کۆلانان کەوتن، ناچار هەستم لەخۆ بڕی، گیان لەجێیـەکی قەیمـە ناهێتـە دەرەوە، لـەناکاوێك لـە ڕۆژی دوایی زوو بەخۆ بەنێچیرەوە بۆی دەرپـەڕیم، کارێکی ناڕەوایـە، بەنـدە شتێکی لەدەست بیٚ و نـەیکات، دەسـت بـەتاڵ بچتە خزمـەت پاشایان، باوڕناکـەم دڵـت شـتێکی تـر ببـات، دەزانم تـۆ دەسـتکوژی خـۆت نـەبی نـایخۆی، بـەڵام ئـەوە دەرمانە، بەڵکو خوا بەزەیی بە ئێمەدا دیتـەوە زوو چاك دەبیتـەوە، نـازانم ئێمـە چ زیانێکمان لـەبارەگای پاشامان لێکـەوتووە، گورگـی ناهـەموار دەڵێتـە مـن تـۆ

چەند هیچ پووچ و ترستۆکی ئەو نێچیرە تەڕو ناسکانە بەخۆت ناخۆیت، لەزاری ماڵ و منداڵت دەگریەوە دەرخواردی شێرێکی دەغەری دەدەیت، ئەمڕۆ سبەی دەمریت، لە ئێمەش هار دەکەیت فێڵی چاوچنۆکی دەکەیت، چلێس دەبێت، گێلە نازانی گەورەو پێشەوایان باکیان بەدەستوپێوەندو دیاری بچووکانەوە نییە، هەر نازانن لەکێوە هاتووە.

شێرە هەستایە سەر پێ هۆش و کەللەی لەسەر دانەما، مووەکانی وەك نەشتەر ڕاوەستان، نەڕاندی، هەر ئێستا دەمەوێت گورگ بێتە ئێرە، بەسزای خۆی بگات.

ڕێوی گوتی پاشام سەرفیراز بێت، ئەتو لە دڵپاکی و پاکی خۆت چت لە دەست ناهێت، هەر یەکێك بێتە لات، یەکدوو قسەی خۆشت لەگەڵ بکات، باوڕ دەکەی خاو دەبییەوە، یەکێك لەگەڵ تۆ ڕاست نەبی، وا بە باشی دەزانم فەرمان بدەن پێستی تەپلی سەری بێننە بنی پێی، ئینجا بەڕەڵڵای بکەن تا ئەوانی تر پێی تەمبێ خواردوو بن، ئەو جۆرە کەسانە ببنە پەندو ئامۆژگاری بۆ سەرپێچکەرانی تر، تا کەس پێ لە تەختەی چرووك نەنێن، گەورەم دوو ڕۆژە لەخەمان و لە ترسان نەنووستووم تکایە ماوەم بدەن دەچم کەمێك پشوو دەدەم و چاو گەرم دەکەم دوای ماوەدان دەم بەنزاو پاڕانەوە، دەرچوو، لەبەرچاوان بزربوو، یەکدوو شامبازی هاویشت چوو لە لاتەریکێکەوە، سەیری هاتنی گورگی کرد.

پاش چەنداوێك گورگ وارە وارە ، بێخۆکاو بەرەو دیوەخان دەچوو، دیوەخان مۆنجەی دەهات، دانیشتوان نەخشەی کارەساتێکیان دەکێشا جگە لەمام گورگی نەبی، لەهەموویان بێترس تربوو خۆی گەیاندە شێرەکەو سەلامی لێکرد، شێرە بێئەوەی کرکەی لەگەڵ بکات، چاوی پەڕییە تەوقی سەری، هەڵمەتی بردە سەری چەنگی لێگیر کرد، پێستی تەپلی سەری هێنا بن پێی،

گوتی: هەر ئێستا بەرچاوم بەردە، بڕۆ دەرێ، گورگ بەلاکە لاکە گەڕایەوە، پێستی لەدوا دەخشا.
ڕێوی لە لانکارێکەوە وەستابوو، بەگاڵتە پێکردنەوە: کێخوای زەنگەبات عەبات هەر کێشە.
* ئەم پەندە بە کەسێك دەڵێن لەخۆڕا خۆ تێکەڵ بەکارێك بکات و دوو زمانیشی تێدا بکات سزای دوو زمانی وەربگریتەوە.

## 175- کین گازر نابی.

سەیدەوان خۆش ڕاوچی بوو، کوڕەکەشی تۆزی باوکی دەشکاند، میوانیان دێت ناگزوور دەبن.
باوکە: ڕۆڵە لە باوکتە چمان نییە، میوان بیخوات، زووکە بڕۆ نێچیرێك ڕاو بکە، زوو بیهێنەوە، با شەرمەزار نەبین.
کوڕە: باوکە گیان فەرمایشت لەسەرسەری لەسەرچاوان، بمبوورە، نەخۆشم، ناتوانم بچم، باوکە دەگەڕێتەوە لای میوانی، کوڕە چۆن باوکم فەرمانیشتەکەی ئەنجام نەدرێت، بە لاکە لاك بۆی دەرچوو، لەبازگەیەك خۆی مات کرد.
باوکە، نێچیروان دەرفەت لەمیوان دەخوازێ، خۆ دەگەینیتە بازگان، باوکی چەمبەری چاوەکانی ئەوەندە بڕ ناکات، ڕیشی کوڕەکەی لەناو بازگەدا بای لێدەدا، وادەزانی نێرییە کێوییە، نیشانەی لێدەگری وەریدەگێڕی، خۆ دەگەینتی، سەیر دەکات کوڕە تاقانەکەیەتی، دەیخاتە ناو جەواڵێکە بە پشتی خۆی دەدات، حەفت شەوو حەفت ڕۆژ دێ و دەچێت بەندی پێدا هەڵدەڵێت، بەڵکو چاك ببێتەوە، خوا پەکی خۆی لەسەر کەس نەخستووە، خەمخۆرانی زۆر بە ڕوویا دێن‌و دەچن، داد نادات.
پیرێژنێك پارچە کینێك و کوتێك دەست دەداتێ هەر دەیشواو دەیشواتەوە.

**سەیدەوان: ها داپیرە ئەوەچی دەکەیت؟**

**پیرێژن: داپیرەی ڕەق و هیشك لەسەرت گەڕێ ئەو کینەی وەك پیفۆکی سپی بکەمەوە.**

**سەیدەوان: داپیرە کین گازرنابی.**

**پیرێژن: ڕۆڵە مردوو زیندوو نابێەوە.**

**سەیدەوان ڕاست دەکەیت، تەرمەکەی لەکوڵی هێنا خوارەوە، شاردیانەوە، بەخاکیان سپارد.**



# ژياننامەی نووسەر

**عومەر شێخەڵلا دەشتەكی، پایزی 1941 لە گوندی قوشاغلو سەر بە ناحیەی قوشتەپەی پارێزگای هەولێر چاوی بە دونیا هەڵێناوە. خوشك و برایەكی بە ناوی( سالح ــ ئاسك)هەبووە، خوایان لێخۆش بێت. هەر لە سەرەتای ژیانی لە خێزانێكی هەژاری چەوساوە ژیاوە، بە منداڵی خەریكی جوتیاری بووە (شێخەڵلا)ی باوكی پیاوێكی لەسەرخۆو دونیا دیدەو چاو تێرو تێگەیشتوو بووە، بۆیە لە پایزی ساڵی 1951 كاتێ عومەری كوڕی خەریكی جۆتكردن بووە، جۆتەكەی پێ بەردەداتوو دەیخاتە بەر خوێندن، كە ئەو كات خێزانی گوند و لادێ نشین زۆر پێویستیان بە جوتیاری هەبووە، وەكو خۆی گێڕایتیەوەو گوتویەتی:(تەمەنم نزیكەی10 ساڵ دەبوو، تازە دەهات بتوانم جۆت بكەم، پێیان دەوتم بە خوای جوتیارێكی چاكی لێدەردەچێ، دەیگوت زۆر كەیفم بە خۆ دەهات، جا ئەو كات لەكاتی جۆتكردن باوكم هات و گوتی: كوڕم جۆتەكەی بەردە، منیش زۆرم پێناخۆش بوو، بەڵام فایدەی نەبوو، گوتی: كوڕم برۆ بخوێنە با كۆڵەوارو نەخوێندەوار دەرنەچی، وەكو مە لە دوو كلكی حەیوان گەورەبی، كوڕم بابیبە ڕۆلەیەكی باش، ئەو میللەتە سودت لێوەربگرن).**

**ساڵی1951 بۆ یەكەم جار لەگەڵ هاوڕێیەكی بە ناوی (شەوكەت وەیسی) دەچێتە قوتابخانەی قوشاغلوی سەرەتایی، لەو ژوورەی باوكی بۆی دروست كربوو، كە پێیان دەگوت(حوجرە)لەگەڵ شەوكەتی هاوڕێی و مامۆستا (عەبدولخالق**

عەلائەدین)کە مامۆستای گوندەکەیان بووە، ژیانی ڕۆژانەیان گوزەرانـدووە، کـە ئـەو مامۆسـتا نـشتیمانپەروەرە زۆر لـە شـعرەکانی بێکـەس و دڵـدارو هـی خۆشـی فێرکردوون. لـە سـاڵی 1956 بـیرو هەسـتی نـشتیمانپەروەری لای مامۆسـتا عومـەر چەکەرە دەکات، وێنەیەکی(مەلا مستەفای بارزانی)نەمر پەیدا دەکات و دەیـدات بـە (شـەوکەت)ی هـاوڕێی و پێـی دەڵێـت: ئـەوە سـەرکردەی کـوردەو داوای مـافی کـورد دەکات و دەیەوێت میللەتی کورد بە ئامانجی خۆی بگەیەنێت، کە ئەوسا ئـەو شـتانە قەدەغەبووە. هەر لەو ساڵەشدا بەشداری لە(گۆڤاری هەتاو)کردووە، کـە لـە هـەولێر لەلایەن مامۆستا گیو موکریـانی دەرچـووە، لەگـەڵ هـاوڕێ کـەی تـاوتوێی ڕۆژنامـەی ئازادیشیان کردووە، بەقەد ئاستی ئەوسایان خۆیان لە قەرەی سیاسەت داوە.

سـاڵی1957 دوای ئـەوەی پـۆلی شەشـەمی سـەرەتایی تـەواو دەکـات، بـەهۆی نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی لە گوندەکەیان دەچێتە هەولێرو لـەوێ ناوەنـدی و ئامادەیی تەواودەکات. ساڵی1962 لە پـۆلی پێنجـەمی دواناوەنـدی یەکـەم چـیرۆکی بـەناوی (خـانزدی بـەخت ڕەش) لـە ڕۆژنامەیـەکی ئەوسـا وەکـو یەکـەم بەرهـەم و دەست پێکی ئەدەبی بڵاوکردۆتەوە، کە لەو ڕێگایەوە چووەتە ناو دونیـای ئـەدەبیات و نووسینەوە.

سـاڵی1963 لـە ماڵـەوە بـەرەو لای بیـستانە دەچـێ بـۆ ئـەوەی پەیوەنـدی بـە ڕیزەکانی پێشمەرگەوە بکات و چەك هەڵگرێ، بەڵام لـە مورتکـەی گـەورە خزمێکـی قەناعـەتی پێهێنـا بـوو، کـە بگەڕێتـەوەو خوێنـدن تـەواو بکـات، چـونکە شـۆڕش پێشمەرگەی قارەمانی زۆرە، چـەك هـەڵبگرن، بـەڵام پێویـستی بـە قەڵـەم هـەڵگرە و پێویستی بە کوردی ڕۆشـنبیرو خوێنـدەوارە بـۆ ئـەوەی میللـەت سـوودی لێببینێـت، بۆیـە بڕیـاری گەڕانـەوە دەدات، خـەباتی خـۆی دەگوازێتـەوە بـۆ خـەباتی قەڵـەم و خوێندنەکەی تەواو دەکات و ساڵی1964 ــ 1965 لە کۆلیجی ئـادابی زانکـۆی بەغـدا - بەشـی کـوردی - وەردەگـیرێ، بـۆ مێـژوو پێویـستە ئـەوە بـووترێ، وەکـو

مامۆستا شەوكەت وەیسی هاوڕێی شایەد حاڵە: كە ئەوسا ئەو لەبەشی كوردی وەرگیرا زۆر كەس بەچاوێكی سوك و نزم ڕوانیویانەتە ئەم بەشەو گوتویانە(تنازل) بكە بۆ بەشێكی تر، بەڵام مامۆستا عومەر گوتوویەتی: (كورد ئەو چەكە شەرەفمەندەی لە شاخ هەڵی گرتووە بۆئەوەیەتی بگاتە ئامانج و مافە ڕەواكانی خۆی، ئەوا(بەشی كوردی) كورد زۆر پێویستی پێ دەبێ، ئەگەر خوا نەكات شۆڕشی كوردی شكست بێنێ، ئەوا ئێمە بۆ بمێنین و ژیانمان بۆچییە)؟ بۆیە لە بەشەكەی خۆی كە (بەشی زمانی كوردی) بووە درێژە بە خوێندن دەدات .

بۆیە عومەر شێخەڵلای نیشتیمانپەروەر چوار ساڵی خوێندنی لە بەغدا تەواو دەكات، وەكوخۆی گێڕایتیەوە(بەكۆڵە مەرگی و هەژاری) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ كاتێك لە خەباتی نیو ڕیزی قوتابیان سلی نەكردووەو هەر پێشڕەوی خەباتیش بووە. تا ساڵی 1968دوای تەواوكردنی خوێندنەكەی دەگەڕێتەوە هەولێر، بۆ یەكەمجار بە (مامۆستای زانكۆیی)لە قوتابخانەی سۆرانی سەرەتایی لە شاری هەولێر دادەمەزرێ، تا ساڵی 1969 لەگەڵ خاتوو(شكریە محەمەدئەمین ڕواندزی)ژیانی هاوسەریەتی پێك دەهێنێ، كە ناوبراویش لە پێناوی مافەكانی ئافرەتان و مافە ڕەواكانی كوردو كوردستان زۆر خەباتی كردووە. ساڵی1970 دوای بەیاننامەی یانزەی ئازار دەگوازرێتەوە بۆ میلاكی دواناوەندی و ڕەوانەی شارۆچكەی ڕواندز دەكرێ، ماوەی ساڵێك لەوێ دەمێنێتەوە، هەر لەو ساڵانە لەگەڵ لیژنەیەك دانراوە بۆ كۆكردنەوەی بەرهەمی فۆلكلۆری كوردی، بۆیە گەڵێ پەندوو بەرهەمی فۆلكلۆری ئەو ناوچەیە كۆدەكاتەوەو لە فەوتان ڕزگاریان دەكات، هەر ئەو ساڵیش یەكەم كتێب و نۆبەری پەندی كوردی بەرگی یەكەم لەسەر ئەركی خۆی بەچاپ دەگەیەنێ، پاشان بەرگەكانی دووەم و سێیەم و چوارەمیشی چاپكردووە، دواتر كتێبی داستان و گۆرانی لە فۆلكلۆری كوردی، بەرگی یەكەم و دووەمی لەسەر ئەركی وەزارەتی ڕۆشنبیری حكومەتی كوردستان بەچاپ گەیاندووە، سەرەڕای

نووسـین وبلاّوكردنـەوەی چـەندین وتـارو لێكۆڵینـەوەی فۆلكلـۆری لـە گۆڤـارو ڕۆژنامـەكان . دوای سـاڵێك گەڕاوەتـەوە هـەولێرو لـە هەرسـێ ناوەنـدی زۆزان و قەنـدیل و جمهـوری بـۆ مـاوەی جیـا جیـا وەكـو مامۆسـتاو یاریـدەدەرو بەڕێوەبـەر خزمەتی پرۆسەی پەروەردەی كردووە.

ساڵی 1974 لە دائـیرەی ئـەمنی هـەولێر لەگـەڵ مامۆسـتا شـەوكەتی هـاوڕێی و پەنجا كەسی تر دەگیرێ، دوایی چل كەسیان ئازاد دەكـرێن، بـەلاّم ئـەمان لـە زینـدان دەمینێنـەوە، دوای شـەش مـانگ لـە ئەشـكەنجەو ئـازارێكی زۆر، كـە تـا مردنیـشی شێنەواری ئەشكەنجەو دەرهێنـانی نینۆكـەكانی بـە جەسـتەیەوە هـەرمابووە، ئـازاد دەكـرێ. دوای ئـازادبوونی لـە بەندیخانـە خـۆی بـە فۆلكلـۆرو كۆكردنـەوەی پەنـدو دەولەمەندكردنی ئـەدەبی كوردی خـەریك كـردووە. سـاڵی 1980 تەمـسیلیەكی بـە نـاوی (هـەبوو نـەبوو) نووسـیوە، وەكـو شـانۆگەری لـە (هـۆلی گـەل)لـە هـەولێر پێشكەشكراوە، كە ئەوسا سـەركەوتنێكی جـەماوەری زۆری بەدەسـتهێناوە، هـەر لـەو سالاّنەشدا لە كۆلیژەكانی زانكۆی سەلاحەدین وەك وانە بێژ زمان و ئـەدەبی كـوردی گوتووتەوە. لە كۆتایی هەشتاكان بە هۆی ئەوەی كە داواكاری بۆ خوێنـدی ماجـستێرو دكتۆرا پێشكەش كردبوو، لە ولاتـی نەمـسا وەردەگـیرێ، هـەموو تاقیكردنـەوەكان بـە پلەی زۆرباش لە بەغدا ئەنجام دەدات، كاروبـارو پێداویـستی سـەفەرەكەی بـۆ ولاتـی نەمسا ئامادە دەكات، بۆ دواجار كەدەیـەوێ سـەفەربكات، حكومـەتی عێـراق داوای لێ دەكـات، لـە نەمـسا كـار لەگـەڵ سـەفارەتی عێـراق بكـات و ببێـت بـە بەعـسی، بـەلاّم مامۆستا عومەر شێخەڵلای نشتیمانپەروەر داواكە ڕەتدەكاتـەوە، بۆیـە ئـەو ئاواتـەی چــەندین ســاڵ بــوو خــەونی پێــوەدەبینی، دەكاتــە قوربــانی هەڵوێــستە نشتیمانپەروەریەكەی و قوربانی كوردو كوردستان و خوێنی شەهیدان.

دوای ڕاپەڕینـە شـكۆدارەكەی بـەهاری 1991 دەبێتـە ئەنـدامی منـداڵ پـارێزی كوردسـتان و بەشـداری دەكـات لـە دامەزراندنـەوەی دەسـتەی فۆلكلۆرپـەروەرانی

کوردستان و دەبێتە ئەندامی پلەیەکی مافی مرۆڤ و کۆمەڵەی ئاشتی و ئەندامی یەکێتی مامۆستایانی پیشەیی و ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بووە، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد بوەتە ئەندام و دەورێکی چالاکی تیادا بینیوە.

ساڵی 1995 دەبێتە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی، لە دانانی پرۆگرامەکانی خوێندنی زمان و ئەدەبی کوردی بەشدار بووە. ساڵی 2004 بەداوەتێکی فەرمی لەگەڵ مەکتەبی سکرتاریەتی یەکێتی مامۆستایانی دەچێتە وڵاتی ئوردن بەشداری دەورەیەکی چەند ڕۆژە دەکات. ساڵی 2005 لە بەر لێهاتویی خۆی بۆ جارێکی تر لەگەڵ یەکێتی مامۆستایانی کوردستان دەچێتە وڵاتی تورکیا.

دوای ئەو کاروانە پڕ شکۆیەی ژیانی سەد مخابن لە ڕێکەوتی 2005/9/27 لە شاری هەولێر بۆ دواجار دڵە گەورەکەی لە لێدان دەکەوێ، لە گۆڕستانی دێی قوشاغلو بەخاك دەسپێردرێ.

| زنجیرە | ناوی كتێب | ناوی نووسەر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|
| 1) | بەركوتێكی مەتەڵی فۆلكلۆری كوردی | سەدرەدین نورەدین ئەبوبەكر | 2005 |
| 2) | دەروازەیەك بۆ بۆتەكانی موزیك | غەمگین فەرەج | 2005 |
| 3) | وەرز و ساڵنامەی میللی لەپەند و شیعری كوریدا | پ . د شوكریە رەسول | 2005 |
| 4) | لەبارەی كۆكوردنەوەی موزیكی میللیدا<br>بە زمانی(كوردی عەرەبی) | مود كار بلیس و ئەرنولد باكیە.<br>و/ تاریق سالح | 2005 |
| 5) | چلاواز 1 | وریا ئحمەد | 2006 |
| 6) | پەندی كوردی: چیرۆكەكەی | عومەر شێخەڵلا دەشتەكی | 2006 |